# (١)

**تازە هەتاو لەنێوان کێوەکان سەری دەر هێنابوو.**

کوخەکەی کەوتبووە قەدپاڵێکەوە. دەرگایەکی تەختە و پەنجەرەیەکی بچووکی تەختە، دوو ترووسکایی بوون لە کوخەکەیەوە دەیانڕوانییە دەرەوە. لە بەردەم کوخەکەی دارتوویەک و دار سوورەچنارێکی ناشتبوو. تەمەنی هەردوو دارەکە، تەمەنی دروستبوونی کوخەکە و تەنیاییەکەی دەر دەخست. لەتەنیشتیەوە جۆگەئاوێکی بەفراوی لە شاخە سپییەکەوە دەهاتە خوار و بە بەردەم کوخەکەدا خوڕەی دەکرد و دەڕژایە دۆڵەکەوە. زستانان هێندە بەفر دەباری، ڕووی دەدا ڕۆژێک تا ئێوارە خەریک بێت تا دەرگاکەی بکاتەوە.

لەم قەدپاڵەدا توولەڕێیەکیش کوخەکەی دەبەستەوە بە باخەکەی پشتەوە و کێوەکەی پشتی. لەو باخەی کە خۆی چاندبووی، زۆربەی ئەو میوانە هەبوون کە لە دڵەوە ئارەزووی دەکردن. کەرەستەکانی ناو کوخەکەی بە دەستی خۆی دروست کردبوون. ئەوەی پێویست بوو لەم ژیانە

بچکۆلەیەیدا بۆ خۆی دابین بکات، دابینی کردبوو. تەنها کێشەی لەگەڵ ئەوەدا بوو هەندێک لەو خۆراکە دەگمەنانەی پێشتر تامی کردبوون، لەناو ئەم کێوانەدا بۆی نەدەچێنران و تامیانی بیر چووبوویەوە.

لەو بەیانییەدا بەبێ بیرکردنەوە، کاتێک تیشکی هەتاوەکە دای لە لقی سەرەوەی سوورەچنارە بەرزەکە، کەمێک نان، گۆزەیەک شەراب (کە خۆی دروستی دەکرد)، دەستنووسەکانی، خستە نێو تێشوویەک و بە لایەکی کەرەکەوەی بەستنەوە، دەستێکی هێنا بە ڕیشە درێژەکەیدا، پێلاوە کۆنە بەدەستچنراوەکانی دەستی خۆی تەکاند و کردنیە پێی، کڵاوێکی کردە سەری و قژە ماشوبرنجییەکەی لەقەراغی کڵاوەکەوە بریسکەی دەهات، مێزەرێکیشی پێچا بە کڵاوەکەوە. ڕەشوەی کەرەکەی گرت و بە توولەڕێکەدا هێواش هێواش هاتە خوارەوە. لەقەراغ توولەڕێکە دڕکی لێ بوو، دەچەقینە قولاپەی پێیەکانی. لە هەر چەقینێکدا ئازارێک دەگەیشت بە قاچی و زەردەخەنەیەکی دەکرد!

(ئازار بۆ هۆشیارکردنەوەی مرۆڤ پێویستە.)

ئاسمان سامال بوو. تیشکی هەتاوەکە وردە وردە تینی بە زەوی گەیاند. گەرمایەک دەیدا لە پشتەملی و دڵۆپەئارەقەکانی لاملی بەنەرمی بەر دەبوونەوە بۆ ژێر کراسە بۆر و بەدەستچنراوەکەی دەستی خۆی. داربەڕووەکانی ئەمبەر و ئەوبەری توولەڕێگاکە هێشتا بەتەواوەتی چرۆیان نەکردبوو، بەس ڕۆحێک هاتبوویەوە بەریان، کەچی تیشکی هەتاوەکە عارەقەی بە مرۆڤ دەکرد. بەدەم ڕێوە سەیری دیمەنەکانی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکەی دەکرد: (چی وات لێ دەکات ئەم

هەموو جوانییە جێ بهێڵێت؟)

بە ئاسمانی دۆڵەکەوە دوو باز شەقەی باڵیان دەهات. لەگەڵ فڕینە ڕێک و سەربازییەکەیاندا قیژەیەکیان دەکرد و دەنگی قیژەکەیان بەسەر دۆڵەکەدا دەرژا.

کێوەکەی بڕی و کەوتە بەردەم دەشتێکی ڕەنگاوڕەنگ. لەو شوێنانەی زەوییەکان تازە کێڵرابوون، بۆنێکی خۆش لەناو کێڵانەکەوە بەرز دەبوویەوە.

(مرۆڤ نەتوانێت خەونەکانی بکێڵێت، ناتوانێت ئومێدێک دروست بکات.)

## (٢)

**پەلەگەنمەکان بەدەست -با-وە پەریشان بوون.**

توولەڕێی ناو زەوییە کشتوکاڵییەکان خۆی ئاڵاندبوویە ئەمبەر و ئەوبەری کێڵگەکان و بە شێوەیەکی نازک بەرچاوی ڕێبواری ڕوون دەکردەوە. پۆلێک باڵندەی کێوی لەناو زەوییە کێڵراوەکاندا سەریان نابوویە یەک، بۆ دان دەگەڕان. یەکێکیان لە شوێنی خۆی بەرز دەبوویەوە و یەکێکیان سەری نابوو بە زەوییەکەوە، لەم جووڵە خێرایانەیاندا، هەر ئەوەندەت دەزانی پێکەوە بەرز دەبوونەوە و دیسانەوە دەنیشتنەوە. هێشتا ڕۆژەکە باوێشکی بەیانی دەدا. پۆڕێک لەناو جارێک گەنمدا دای لە شەقەی باڵ و بێدەنگییەکەی شکاند.

(هەموو فڕینێک جوانە.)

تا چاو بڕی دەکرد، ڕەنگ دیار بوو، ڕەنگی سەوز، زۆر سەوز، ڕەنگی قاوەییی تۆخ، قاوەییی کاڵ، ڕەنگی خۆشەلەمێشی، هەزاران ڕەنگ بەتەنیشت یەکەوە قەتارەیان بەستبوو، لەو نیگارە کۆنانە دەچوون، کە کاتی خۆی بە دیواری ناوەوەی کڵێساکاندا دەنەخشێنران. لەوسەرەوە وەک

ئاقانەیەک، دارێک بەتەنیا لە ناوەڕاستی کێڵگەیەکدا سنگی خۆی دەر پەڕاندبوو، بەتەنیا سەیری کێڵگەکانی دەکرد.

(تەنیایی ئومێدە.)

دەنگی چەند کڵاوکوڕەیەک دەهات. دەنگەکەیان تەنها ئاماژەیەک بوو بۆ بانگی سروشت. هەتا دەنگی کڵاوکوڕەکان نەیەت، هێشتا هەست بە بوونی سروشت ناکەیت.

(هەموو دەنگێک لە سروشتەوە دێت.)

لەسەر تووڵەڕێی ناو کێڵگەکە، جووتێک کڵاوکوڕە، یارییان لەگەڵ ڕێبوارە تازەکە دەکرد، لە بەردەمی دەنیشتنەوە تا نزیک بێتەوە، کە نزیک دەبوویەوە، هەڵدەفڕین و دەچوون لەولاوە دیسانەوە دەنیشتنەوە، بەم شێوەیە کەوتبوونە گەمەکردن لەگەڵیدا.

بەسەر تەپۆڵکەیەکدا سەر کەوت، کاتێک گەیشتە سەر تەپۆڵکەکە، هەستی بە دوورکەوتنەوە کرد لە خۆی. تاوێک ڕوانییە ڕێگاکەی بەردەمی و پاشان سەیرێکی دواوەی خۆی کرد و زۆر بەئەسپایی، کە تەنها خۆی گوێی لێ بێت، دەستی کرد بە وتنی گۆرانی.

( مرۆڤ زۆر بەئاسانی لە جوانییەکان دوور دەکەوێتەوە.)

نیگەرانییەکی تێدا بوو، ئەما بڕواکانی لە نیگەرانییەکەی گەورەتر بوون، هێشتا ئەوەندەش دوور نەکەوتبوویەوە، کەچی بیری تاکە کوخەکەی خۆی دەکرد.

ویستی تاوێک دانیشێت، بیری کردەوە هیچ ماندووبوونێک شک نابات تا دانیشێت. هەر چۆن یەکەم جار بەنەرمی دەستی کرد بە جێهێشتنی شوێنەکەی، بە هەمان شێوە کەوتەوە ڕێ، لەسەر گردەکەوە دەستی خستە سەر

نێوچاوانی تا بەر بە خۆرەکە بگرێت و بۆ دوور بڕوانێت. لە دوورەوە هەندێک پەڵەی ڕەش دیار بوون، ڕوون نەبوو ئاوەدانییە، یان ئەوانیش کێڵگەن. لەتەنیشت پەڵە ڕەشەکاندا بریسکەی ڕووبارێکی گەورە دەهات، لەتەنیشت ڕووبارەکەوە تەپوتۆزێک بەشوێن غاردانی ئەسپەکانەوە دەر دەکەوت.

# (٣)

**لە نشێوێکدا گوێی لە خوڕەی ئاو بوو.**

لـە دەنگـی خوڕەکـە نزیـک بوویـەوە. چـاوی بـە ئاوێکـی پاکـی ڕوون کـەوت، ئاوەکـە لەنێـوان دوو بـەردەوە دەهاتـە دەرەوە و بەنەرمـی زەوییەکـەی لا دابـوو، ڕێگـای بـۆ خـۆی کردبوویـەوە، بەنـاو گیـاکان و کێلگـە کێڵراوەکانـدا دەڕۆیشـت. لغـاوی کەرەکـەی شـل کـرد و دەسـتی کـرد بـە فیکەلێدان. کەرەکـەی تێگەیشـت خاوەنەکـەی بانگـی دەکات تـا پێکـەوە ئاوێک بخۆنـەوە. هەردووکیان، ئەو بە لمۆزی، ئەم بە دەستە زبـر و پڕدەمارەکانـی، دەسـتیان کـرد بـە ئاوخواردنـەوە. کـە تینوێتیـی خۆیـان شـکاند، کەرەکـە سـەرێکی بـەرز کـردەوە، لووشکەیەکی بۆ کرد و بە چاوە ڕەش و پاکەکانی سـەیرێکی خاوەنەکـەی کـرد. (وەک بڵێت: سوپاسـی دەکات.)

ئەمیش دوو مشـت ئـاوی پڕژانـد بـە دەموچاویدا و فێنکـی ڕوخسـاری داگـرت. هەڵسـا دەسـتی بـرد لەنـاو تێشـووەکەی پارچەیـەک نانـی دەر هێنـا و ژەنـدی بـە ئاوەکـەدا و خسـتیە دەمیـەوە. لـەو کاتـەدا خەریکـی خواردنـی نانـە تەڕەکـە بـوو،

چاوی لێ بوو لەناو گیاکانەوە مارێک، بەبێ ئەوەی بترسێت، هات بۆ سەر جۆگەئاوەکە و دەستی کرد بە خواردنەوەی ئاو. ئەمیش هەر لە جێگای خۆیەوە لە جوانیی ئەو دیمەنە ڕادەما.

(مرۆڤ دەستی نەبووایە، جوانترین گیانەوەر دەبوو.)

حەزی نەدەکرد چاو لەو دیمەنە هەڵکەنێت. مارەکە لەگەڵ تێربووندا، پێچێکی خوارد و بە شوێنی خۆیدا ڕۆیشت. ئەمیش جڵەوی کەرەکەی گرت بەدەستیەوە و بەشوێن یەکتریدا کەوتنە ڕێ و چوونەوە سەر تووڵەڕێ باریک و درێژەکە. چەند هەنگاوێک لە ئاوەکە دوور کەوتنەوە، پۆڕێک لەسەر ڕێگاکە کەوتبوو. کە دەستی بۆ برد، بینیی پۆڕەکە مردار بووەتەوە. شوێنبرینێک لەسەر سنگی بوو. بە شوێنی برینەکەدا دیار بوو ڕاوچییەکان ڕاویان کردووە و لە کاتی ئازاری مردندا فڕیوە و بۆیان نەدۆزراوەتەوە.

(ڕاوچییەکان لە هەموو شوێنێک هەن.)

قاچی پۆڕەکەی گرت و لە یەکێک لەو زەوییە کێڵراوانەدا چاڵێکی بۆ هەڵکەند و دوو مشت خۆڵی کرد بە سەریدا. پیاوێکی ناسک نەبوو، بەس لەو هەموو ساڵەی لە ژیانی تەنیایی لەو کێوانەدا، بۆ جارێکیش بیری لەوە نەکردەوە باڵندەیەک، کەروێشکێک، کەڵێک ڕاو بکات و گۆشتەکەی بخوات.

(سەیرکردنی گیانەوەران بەچێژترە لە خواردنیان.)

دەیزانی مرۆڤ بەبێ گۆشتخواردن نامرێت و بەبێ گۆشتخواردنیش نابێتە فریشتە. بە شتێکی زیادی دەزانی لەبەر خاتری چێژێکی خۆی گیانێک بکێشێت. مرۆڤەکان

لەبەر خۆیان لەم سەرزەوییە چییان پێ خۆش بێت دەیکەن، ئەوانەشیان کە خۆیان زۆر لە خوداوە بە نزیک دەزانن، ددانیان تیژترە لە ددانی دڕندەیەکی گۆشتخۆری ناو دارستان.

دەستەکانی خۆی تەکاند و دەستێکی خستە سەر ملی کەرەکەی و هاوڕێیانە پێی وت:

(تۆش تا ئەو کاتە خۆشەویستی، خزمەتی مرۆڤ بکەیت.)

# (٤)

**ئاوەدانی دیار نەبوو.**

بەبێ ئەوەی دڵەڕاوکێ بیگرێت، بەئارامی بە سەیرکردنی دیمەنەکان، بە ڕێگای خۆیدا دەڕۆیشت. کەواکەی بەری قورس ببوو، نەیدەویست دای بکەنێت، دەترسا دووهەوا بکەوێت و نەخۆش بکەوێت.

نیوەڕۆ نزیک بوویەوە. خۆر هاتبوویە نێوەڕاستی ئاسمان. بە شێوەیەکی خۆنوێنانە لە نێوەڕاستدا وەستابوو، سەیری زەویی دەکرد. ئاسمان لەلای کێوەکانەوە دوو پەڵەهەوری سپیی لەخۆ گرتبوو. کە سەیری دواوەی دەکرد، سێ جۆر کێوی دەبینی. کێوێک ڕەش، کێوێک سەوز، کێوێکی مەیلەوسپی. هەتا کێوەکان بەرزتر بن، سپیترن.

( لەناو کێوەکاندا هێزێک هەیە، هەرکەسێک لێیانەوە نزیک بێت، ئیرادەی بەهێزتر دەبێت.)

چاوی دەگێڕا سێبەرێک، ئاوێک بدۆزێتەوە و خوانی نیوەڕی تێدا بخوات. خەیلێ ڕۆیشتن هیچی بەرچاو نەکەوت. پێدەچێت ئەم دەشتە تەنها کاتی کێڵان مرۆڤ

ڕووی تێ بکات. جاڕەگەنمەکان، جاڕەجۆکان، زەوییە کێڵراوەکان شوێندەستی مرۆڤ بوون، کەچی لەم ڕۆژەدا کەسێک دیار نەبوو. لەم ماخۆلانی چاوگێڕانەدا بوو، لە کەنارێکدا تێدەپەڕی، بریسکەی جۆگەئاوێک هاتە بەرچاوی. بەرەو بریسکەی جۆگەئاوەکە ڕۆیشت. کانییەکی بچکۆلانە، بەهەڵقوڵان حەوزێکی بچکۆلانەی بۆ خۆی دروست کردبوو، زیخەکانی ژێرزەوی لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵدەقوڵان و سەمایان دەکرد.

(هەر شتێک پاک بێت، لە هەرشوێنێک بێت، گەر شوێنەکەش پیس بێت، ناتوانێت پاکییەکەی ئەو شتە کاڵ بکاتەوە.)

دیسانەوە بە فیکە کەرەکەی بانگ کرد. ئەم جارەیان کەرەکە تینووی نەبوو، لەتەنیشت کانییەکە وەستا و دوای سەیرکردنێک، دەستی کرد بە لەوەڕین. ئەمیش کڵاوەکەی لەسەر سەری داگرت و مێزەرەکەی ژەندە بە ئاوی کانییەکەدا و دای بەسەر گیاکاندا، پاشان خستیە سەر شانی. بە تەڕکردنی مێزەرەکەی و دانی بەسەر شانیدا، تەزوویەک هات بە گیانیدا. تەزووەکە ئەو شەوانەی بیر هێنایەوە، کە زستانێکی سارد بوو، لە کوخەکەی بەتەنیا ئاگرێکی کردبوویەوە، لە ترسی دووکەڵی ئاگرەکە پەنجەرەکەی کردبوویەوە، کزەی سەرمایەکی زۆر لە پەنجەرەکەوە خۆی دەکرد بە کوخەکەدا و تەزوویەکی دەهێنا بە گیانیدا. زووزوو دارێکی دەخستە ناو ئاگرەکە و بە لێفە جاجمەکە خۆی دەپێچایەوە و بە ڕووناکیی ئاگرەکە دەستی دەکرد بە نووسینی بەیتێک.

هەندیک جار وای لێ دەهات لە سەرمادا تا بەیانی نەخەوێت. ئەو مێزەرە تەڕەی بەسەر شانیەوە بوو، شەوی زۆر سەختی دەهێنایەوە خەیاڵی.

(یادەوەریی مرۆڤ زۆر سەیرە، هەمیشە سەختییەکان دەپارێزێت.)

# (٥)

**تێشووەکەی لەسەر پشتی کەرەکە داگرت.**

کەواکەی خۆی داکەند و کردی بە سفرە. پارچەنانێکی دەر هێنا و خستیە دەمیەوە، سەری گۆزە شەرابەکەشی کردەوە و قومێکی کرد بەدوای پارچەنانەکەدا.

(شەراب بۆ مەستبوون نییە، بۆ تامکردنی سروشتە.)

جارجارە دەستێکی دەکرد بەناو کانیاوەکەدا و قومێک ئاویشی دەکرد بەشوێن نان و شەرابەکەدا. دانیشتنەکەی لەتەنیشت کانیاوەکە و گیا سەوزەکان، لێدانی دڵی نەرمتر کردبوویەوە. جگە لە خۆی، کەس نەیدەزانی بۆچی بەرەو ئاوەدانی بارگەی خۆی پێچاوەتەوە.

**(مەرج نییە لەناو مرۆڤەکاندا بژیت تەنیا نەبیت.)**

تەنیاییەکەی لەو تەنیاییانە نەبوو بە تێکەڵبوونی مرۆڤ ئاوەدان بکرێتەوە، یان بە دووریی مرۆڤ زیاتر بێت. جۆرێک تەنیایی هەیە لە ناخدایە و پەیوەندیی بە دەرەوە نییە، ئەو تەنیاییەی لە ناخدایە خەمی گەورەی هەڵگرتووە. ئەو تەنیاییەی دەرەوە بۆ مرۆڤی دروست دەکات، تەنیاییەکی

کاتییە و بەرهەمی نییە. لەو جۆرە کەسانە بوو تەنیاییەکەی بەشێک بوو لە ژیان و بیرکردنەوەی، لە هەرشوێنێکی ئەم سەرزەمینە بووایە، هیچ لە تەنیاییەکەی نەدەگۆڕا. لۆمەی خۆیشی دەکرد، کە بۆچی مرۆڤێکی وایە تەنیایی بووەتە سروشتی. گوناهی خۆی نەبوو، ئەو ڕووناکییەی لە ئەودا گەشەی دەکرد، ڕوناکییەک نەبوو بەبێ تەنیاییەکی ڕاستەقینە دەر بکەوێت.

تا تێربوون هەڵنەستایەوە، کە زانیی تێر بووە، نانەکەی پێچایەوە و خۆیئاسا سەری گۆزە شەرابەکەی توند کردەوە و خستیەوە ناو تێشووەکەی و دیسانەوە دایەوە بەسەر کۆڵی کەرەکەدا. هێشتا ماندوو نەبووبوو تا سواری کەرەکە ببێت. وەک هاوڕێیەک لەگەڵیدا بوو، هێندە دەمێکیش بوو پێکەوە لە ئاوەدانی دوور بوون، کەرەکە نالی پێوە نەمابوو، هەر بە سمە ڕەش و ڕەقەکانی خۆی ڕێگاکانی دەبڕی. پێڵاوە بە پێست و دەست چنراوەکانی دەستی خۆیشی، کە لە پێیدا بوون، شێوەی کەشتییەکی بچکۆلانەیان دەنواند لەپێیدا. هەرچیی پێ بوو، بریتی بوو لەو شتانەی خۆی چنیبوونی، خۆی دروستی کردبوون، چ لە کورتانی کەرەکە، چ لە پێڵاو و شەراب و نان و تەنانەت کەواو سەڵتەکەی و کڵاوەکەی.

(مرۆڤ ئەو کاتە خەسار بوو، فێری چاوەڕوانی بوو.)

جلوبەرگ و ماڵی دونیا بە بای خەیاڵیدا نەدەهات. نیوەی ئەم دونیایەت پێ بدایە، نەیدەگۆڕییەوە بە خەوێکی بەدینەهاتووی خۆی. تەنها ڕووتوڕەجاڵ نەبووایە لەبەر سەرما و گەرما، ئیتر ئەوەی لەبەری دەکرد، چ ڕەنگ، چ شێوەیەک بووایە، گوێی نەدەدایە. ئەم خووەی لە گەنجییەوە

بۆ دروست بووبوو. لە گەنجیشدا لە هاوتەمەنەکانی خۆی نەدەچوو، پارچەپەڕۆیەکی کۆنی ناو مەعبەدەکانی دەست بکەوتایە بیکات بە کراسێک، بەشی دوو ساڵی دەکرد.

(مرۆڤەکانی ئێستا بە شێوەیاندا هەڵدەسەنگێنرێن، نەک بە بیرکردنەوەیان.)

## (٦)

**هەتا دەمەو عەسران ڕێی کرد، هەر دەشت بوو.**

نزیکەی ئێوارە تارماییی پەڵەیەکی کەوتە بەرچاو. کە نزیک بوونەوە، زانیی ئەو پەڵەیە باخێکە.

باخەکە لە قەدپاڵی تەپۆڵکەیەکدا بوو، بە داری وشک بە هەرچوار دەوریدا پەرژینێکی شێواوی بۆ کرابوو، لە چەند لاوە پەرژینەکە شکابوو.

(ئەو کاتەی مرۆڤ پەرژینی دروست کرد، ژەهراوی بوو.)

باخەکە قشت و جوان بوو، دیار بوو باخەوانەکەی کەسێکی سەلیقەدارە. ڕیزێک دارگوێز لە بەشی سەرەوەی باخەکە بالاّیان بەرز بووبوویەوە، لەخوار ئەوانەوە، ڕیزێک قۆغ و هەرمێ، لە بەشی خوارەوەی باخەکەش ڕیزێک دارمێو. کێڵێکی بچکۆلەی کۆنیش لە بەشی لای دەستەڕاستی باخەوەکەوە دروست کرابوو، کێڵەکە ڕووی کردبوویە هەتاوی بەیانیان. بچوویتایە سەربانی کێڵەکە، تەواوی ئەو دەشتودەرە لە بەردەمتدا بوو.

لە بەردەم باخەکەدا وەستا، درەختەکان لێرە بەتەواوەتی گەڵایان کردبوو. سێبەری درەختەکان نەیاندەهێشت ناو باخەکەی لێوە دیار بێت. ناچار بە دەنگی بەرز چەند جارێک هاواری کرد، کەس جوابی نەدایەوە. سوکناییی نەهات، دیسانەوە هاواری کرد. (هۆ مرۆڤ...) کەس جوابی نەدایەوە. پێدەچوو هێشتا مرۆڤ لەم ناوە نەبێت. ئیتر لە یەکێک لە پەرژینە شکاوەکانەوە هەنگاوی نا و چوویە ناو باخەکەوە. هەندێک لە درەختەکان هێندە هەڵاڵەیان کردبوو، خۆیان کوشتبوو. بۆنی هەڵاڵان ئەو ناوەی تەنیبوو. چەند باڵندەیەکی کێوییش لەناو باخەکەدا خەریکی کەیفوسەفای خۆیان بوون.

(هەموو شتێک بەو جۆرە جوانە، دەستی لێ نەدەیت و لێگەڕێیت خۆی بێت.)

بەدەست یاریی باڵندەکانەوە هەڵاڵەی درەختەکان لێ دەبوونەوە و شنەباکە هەڵاڵەکانی دەپرژاند بەناو باخەکەدا. کاتێک با هەڵاڵەیەکی بەرز دەکردەوە، باڵندەیەک لە خۆشیی بەرزبوونەوەی هەڵاڵەکە دەفڕی و بە خێراییەکی زۆر خۆی لێ نزیک دەکردەوە و یەک دەنووکی لێ دەدا و لەگەڵ خۆی دەیهێنایەوە خوارەوە. زەردەواڵەکانیش بەدەوری هەڵاڵەکاندا گیزەیان دەهات.

لە سەرەوەی باخەکەوە حەوزێکی پڕئاوی لێ بوو. کارێزێک هەڵکەنرابوو و لە بنارەکەوە چووبوویە ناوەوە، ئاوی کارێزەکە ڕاکێشرابوو بۆ ناو حەوزەکە. کارێزەکە هێندەی لاشەی بەشەرێک کون کرابوو، ئەمبەر و ئەوبەری کونەکە بە بەردی بچووک کەڵەکی بۆ کرابوو، لەتەنیشت کەڵەکەکانیشەوە کۆڵەکەی بچووک بچووک چەقێنرابوون

و لەسەروو کوڵەکەکانەوە ڕیزەچنار دانرابوون، تا ئەگەر زەوییەکە فش بوو، نەتەپێت و کاریزەکە کوێر ببێتەوە.

لەتەنیشت حەوزەکەوە بەردەنوێژێک بە بەردی ساقی پان دروست کرابوو.

(ئەوەی جارێک توانیی سەری نەوی بکات، دەبێت گومان لە عەقڵی بکەیت.)

لەسەر بەردەنوێژەکە دانیشت و کردی بە مەیخانەی ئەو شەوەی خۆی. کەرەکەی بەناو باخەکەدا بەرەڵڵا کرد. ئەوان هێندە هۆگری یەکتری بوون، نەیاندەتوانی یەکتری جێ بهێڵن.

(هۆگربوون لەگەڵ دڕندەترین گیانەوەردا، باشترە لە هۆگربوون لەگەڵ مرۆڤێکی خراپی ئەم سەردەمەدا.)

کەرە خەریک بوو لەناو باخەکەدا بەخۆشی گیا و سەوزییەوە هەڵی دەتووزان، هەڵتووزان و لووشکەکردنەکەی باڵندەکانی لەم درەختەوە دەفڕاند بۆ ئەو درەخت.

## (٧)

**شنەبایەکی فێنک لقی درەختەکانی هێنابوویە سەما.**

کەرەکە بۆخۆی لەناو گیاکەدا دەلەوەڕا. ئەو کەمە ئاوەی بەسەر حەوزەکەدا دەڕژا، جۆگەیەکی دروست کردبوو، بەژێر لقی درەختەکاندا پێچاوپێچ دەچوو لەبن دارمێوەکان گۆماوێکی دەبەست. لەسەر بەردەنوێژەکەوە سەیری ئاسمانت دەکرد، سنگی خۆی کردبوویەوە و شین شین ئەچوویەوە.

دەموچاوێکی بۆ شوشت و کەمێک قاچی خستە ناو حەوزە ئاوەکەوە، تا بەتەواوەتی گیانی فێنک بوویەوە. هەڵسا لەسەر پشتی کەرەکە لێفە جاجمە بەدەستچنراوەکەی دەستی خۆی داگرت و لەبان بەردەنوێژەکە ڕای خست. دەستی کرد بە گەڕان بەناو باخەکەدا. کتوپڕ لە گۆشەی لای چەپی باخەکەوە کۆمەڵێک شیلکی بینی سوور دەچوونەوە. هەندێک لە شیلکەکانی لێکردەوە و چاوێکی گێڕا شتی تر پەیدا بکات، کاتی گەیشتنی هیچ میوەیەک نەبوو.

(بەهار وەرزی کوشتنی نائومێدییە.)

ئارەزووی لەوە بوو بە پێی پەتی بەناو گیاکاندا بگەڕێت.

گیاکان بەبەینی پەنجەکانیدا سەری خۆیان دەر دەهێنا و خوتووکەیان دەدا و ئەوانەشیان بەرز بووبوونەوە، دەئالان لە قولاپەی پێیەکانی و نەرمایی زەوییەکە خورپەیەکی دەدا لە ژێرپێی، خورپەکە لەژێر پێیەکانیەوە تا تەوقی سەری هەست پێ دەکرا.

شیلکەکانی کردە ناو حەوزەکەوە و گۆزەشەرابەکەی دەر هێنا، نانێکیش لەگەڵیدا. دەستی کرد بە خواردنی نان و شیلک و شەراب. کە تۆزێک سەری گەرم بوو، دەستی خستە بناگوێی و گۆرانییەکی خەمگینی کۆنی وت. بە وتنی گۆرانییەکە، ئەو بنارە دەنگی دەدایەوە. خۆر خەریک بوو لەو خوارەوە لە کێوەکان بچێت بەودیودا.

(هەموو ئاوابوونێک، سەرەتایەکە بۆ دەستپێکردنێک.)

ڕەنگە زەردەکەی خۆر لەسەر لا خۆی نەکێشا بە گەڵای باخەکەدا و بریسکەی دەهات. سەرگەرمبوونەکەی و دیمەنە خەمگینەکە نەشئەیان دەخستە دڵیەوە.

(پاشایەتی ئەوەیە ئاسوودە بیت، نەک کۆشک و لەشکرت هەبێت.)

خرکەبەردێکی هێنا و مێزەرەکەی لوول کرد و لەسەر خرکە بەردەکە دای نا، شانێکی خستە سەری و لەسەر لا بەدیار گۆزەشەرابەکەوە خەیاڵی ڕۆیشت بۆ لای کۆڵانی گەنجێتی. لە گەنجێتیدا تێر بە کامی خۆی ژیانی نەبینی، خۆی گەمارۆ دابوو بە کۆمەڵێک خەونەوە، خەونەکانیش بۆ دەسکاریکردنی سەردەمەکەی خۆی بوو، بێئاگا لەوەی سەردەمەکەی نە پێویستی بەو خەونانەیە، نە ئامادەشە وەریان بگرێت. ئاخرییەکەی خەونەکانی تەنگیان پێ هەڵچنی

و تەنانەت سەردەمەکەی خۆیشی جێ هێشت.

(خاوەنانی خەونە گەورەکان، غەریبەکانی سەردەمی خۆیانن.)

# (٨)

**ئاسمان تاریکی کرد.**

وردەوردە ئەستێرەکان سەریان دەر هێنا. لەگەڵ سەیرکردنی ئەستێرەکاندا، چاوی پڕ بوو لە تەماشاکردنی پەرجووەکانی سروشت. لەبەر خۆیەوە باسی لەوە دەکرد، کە دەبێت ئەو ئەستێرانە چییان تێدا بێت. ئاسمانێک بەم هەموو بەرینییەوە، بەم هەموو ئەستێرە و مانگ و هەتاوانەوە، بەم ڕێکوپێکوەستانەوە، ئەبێت چ هونەرێک، چ ژیرییەک ڕێکی خستبێت. هیچکام لەو ئەستێرانە بۆ چرکەیەکیش هەڵە ناکەن. لەوانەیە مرۆڤ بەر ئەو هوشیارییە کەوتبێت، بۆیە کەمێک هوشیارە و لە شتەکان تێدەگات.

(هەموو هوشیاریی مرۆڤەکان، ناگات بە هوشیاریی ئەستێرەیەک.)

ئەو هوشیارییەی لە ئەستێرەکاندایە، قەبارەکەی زۆر گەورەترە لەو هوشیارییەی چەندین سەدەیە مرۆڤ بەشوێنیدا دەگەڕێت. مرۆڤ تا زۆرتر بەر ئەستێرەکان بکەوێت، زۆرتر بەر ئەو هوشیارییە دەکەوێت. ئایینە کۆنەکان نەیانتوانیوە

بەتەواوەتی ئەستێرەکان بناسن، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی کەمیی هوشیاریی مرۆڤەکان. لەم سەردەمەدا ئایینێک دروست ببێت، بێگومان ئایینەکانی دیکە لەناو دەبات، چونکە ئایین زادگەی هوشیاریی مرۆڤە.

هەمیشە بڕوای وا بوو، خودا لە دەرەوەی ئایینەکانە. خودا هوشیارییە بالاکەیە، ئەمانەش ناویان ئەستێرەیە، بەشێکی کەمی ئەو هوشیارییەن کە پارچەپارچە بووە بەسەر گەردووندا. کەی بێت مرۆڤ پەی بەم هوشیارییە بچووکانە ببات و کەی بێت بگاتە نزیک هوشیارییە بالاکە.

گەر هەریەکە ئەستێرەیەکی خۆی هەبێت (ئەستێرەکەی من تەنیاترین ئەستێرەیە.) پێویستە بەبا[illegible] سەیری ئاسمان بکەم، بگەڕێم، تا ئەستێرەکەی خۆم بدۆزمەوە. سەری لە ئاسمان لا نەدەدا و بەتەواوەتی ئەستێرە دوای ئەستێرە لێیان ورد دەبوویەوە.

( ئەم ئاسمانە بەرینە لە بەرچاوی مرۆڤدایە، کەچی مرۆڤ بۆ جارێک هەست بە بچووکیی خۆی ناکات.)

نەشئەی شەرابەکە و شنەبا فێنکەکە و بەرینیی ئاسمان خەیاڵی بەرەو فڕین دەبرد. مێزەرەکەی لەژێر شانی دەر هێنا و دای بەسەر شانیدا. خەریک بوو کزەیەک دەهات، شانەکانی دەتەزاند. خوڕەی ڕۆشتنی ئاوەکەش بەسەر لێواری حەوزەکەدا، هێندە دەنگێکی خۆشی دەهات، دڵی نەدەهات لەو دەنگە دابپڕێت و گۆرانییەک بچڕێت. لەولاوە کەرەکە تێر بووبوو، لەسەر لا بۆی ڕاکشابوو. سەرنجی چوویە سەری و بیری چووبوو کورتانەکەی دابگرێت. هەڵسا کورتانەکەی لێ کردەوە و دەستێکی کردە ملی و چرپاندی

بە گوێیدا، "هاوڕێی بێزیانم، ئیسراحەتی خۆت بکە، ژیان هەمووی ماندووبوونە."

شەرابە نەفرەتییەکە بە دوو قوم وای لێ دەکرد بیر لە شتە گەورەکان بکاتەوە. پێکەنینی دەهات بەوانەی لە گەنجیدا باسیان لە مەستیی شەراب کردبوو. خۆی دوای هاودەمبوونی لەگەڵ شەرابدا، لەبریی ئەوەی بگاتە مەستی، دەگەیشت بە بیرکردنەوە. کە نەشئەکەشی زۆر دەبوو، لە کوخەکەی خۆی هاواری دەکرد، "بۆیە پێغەمبەرەکان شەرابیان نۆشیوە، ئەهلی بیرکردنەوە بوون."

# (٩)

**شەوانی سامال و فێنک، شەوانی بیرکردنەوەیە.**

دەستی لە خواردن و خواردنەوە هەڵگرت. لە گەنجییەوە تاکو ئێستا شەرابی دەخوارد، هیچ کات ڕووی نەداوە مەست بێت. هەمیشە هێندەی دەخواردەوە، نەشئەیەک بیگرێت و خۆشییەک بخاتە ناو گیانیەوە. پاڵی دایەوە بە داریکەوە و دەستی کرد بە بیرکردنەوە لەم گەردوونە. ئەوەی بیری لێ نەدەکردەوە، خۆی بوو. کاتێ خۆی کە بڕیاری دا لە مرۆڤ دوور بکەوێتەوە، دوای بڕیارەکەی جارێکی دیکە بیری لەوە نەکردەوە بۆچی ئەو بڕیارەی داوە. سەردەمی دوورکەوتنەوەی لە مرۆڤ زۆر گەنج بوو، ئێستا پیاوێکی سەروڕیش ماشوبرنجییە. نزیکەی چل ساڵە لە بناری کێوێک بەتەنیا دەژێت. هەرچی میراتی هەیە، ئەو شتانەیە خۆی دروستی کردوون. لەناو تێشووەکەیدا دەستنووسەکانی دەر هێنا. لە بەردی ڕەشی ناو چەمەکان مەرەکەبی دروست کردبوو، لە قامیش قەڵەم، لە کوتینی توێکڵی دار و باریککردنەوەی و وشککردنەوەی، تیانووسی دروست

کردبوو. بەرگی تیانووسەکەشی توێکڵی داربەڕوو بوو. جوان توێکڵەکەی خستبوویە ناو ئاوەوە تا نەرم بێت، پاشان باش کوتیبووی و پان و ڕێکی کردبوویەوە، ئینجا دیسانەوە خستبوویەوە ناو بووڵاوێک و لەبەر خۆر دای نابوو تا وشک ببێتەوە. بەرگێکی ڕەقی پوختی لێ دروست کردبوو. بە تیسکی دارمێوێش، تیانووسەکانی ناوی بەستبوو بە بەرگەکەوە و کتێبێکی شێوە جیاوازی لێ دروست کردبوو. سەیری کتێبەکەت دەکرد، یەکسەرە دەتزانی وەستایەکی دەسترەنگین دروستی نەکردوە. دەستنووسەکانی لە باوەشیدا بوو، هات بە خەیاڵیدا شتێک بنووسێت. دەمێک وەستا و نەیتوانی هیچ بنووسێت.

(هەرچی نووسینی دونیا هەیە، ناتوانێت وا بکات دڕندەکەی ناخی مرۆڤ بکوژێت.)

بەناچاری دەستنووسەکەی دانایەوە و هەرچۆن پاڵی دابوویەوە، بە هەمان شێوە چووە خەیاڵەوە. کاتێک شنەی باکە دەهات، دەیدا بە سەروچاویدا و گۆناکانی گورج دەکردەوە، زەردەخەنەیەکی بۆ دەکرد. دەستی برد پارچەپەڕۆکەی، کە هەم بەمێزەر دەیبەست و هەم دەیدا بەسەر شانیدا، ڕای کێشا و خستیە سەر دەموچاوی. لەژێر پەڕۆکەوە سەیری ئاسمانی دەکرد. ئاسمان لە بەینی تاوەدەزووەکاندا بووبوو بە هەزار پارچەوە. چاوێکی دادەخست و چاوەکەی تری تیل دەکردەوە و لەنێوان تاوە دەزووەکانی مێزەرەکەی سەر دەموچاویدا بۆ ئەستێرە دەگەڕا.

(ژیان تروسکاییەکیش بێت، مرۆڤ دڵی نایەت دەستی لێ هەڵگرێت.)

# (١٠)

**خەوی لێ کەوت.**

لە خەونەکانیدا، وەک هەمیشە، لەناو دارستانێکی چڕدا بوو، لایەکی دارستانەکە سووتابوو، لاکەی تری سەوز سەوز. ئەمیش لەنێوان هەردوو لاکەدا دەوەستا، سەیری ئەمبەری دەکرد دارەکان بە وشکی و کوتەرەیی بەسەر یەکدا کەوتبوون، دڵی تەنگ دەبوو، سەیری ئەوبەریشی دەکرد، سەوز و جوان و پڕ لە باڵندە و گیانەوەر، دڵخۆشییەک دای دەگرت.

(ژیان دوو دیوە.)

مرۆڤ زمانی خراپە، زمانی باش بووایە، لە شتەکان تێدەگەیشت. کێشەکەش لەوەوە دەست پێ دەکات، پێی وایە لە ڕێگای عەقڵ و زمانەوە لە گیانەوەرەکانی تر گەورەترە، کەچی ئەو زمان و عەقڵەی هەیەتی، هێندەی بۆ خراپە و وێرانکاری بەکاری دەهێنێت، بۆ باشترکردنی ژیان بەکاری ناهێنێت. بنەوانی خراپەکانیش لە نەبوونی زماندایە.

(دەبێت زمانی مرۆڤ بگۆڕدرێت)، تا بتوانێت بەرامبەرەکەی

تێبگەیەنێت و خۆشی تێبگات.

لەو کاتانەدا کە سەیری لایە سووتاوەکەی دارستانەکەی دەکرد، دەنگی مرۆڤ دەهاتە بەر گوێی. لەو ساتانەشدا سەیری لایە سەوزەکەی دارستانەکەی دەکرد، دەنگی گیانەوەرەکانی تر دەهاتە بەر گوێی. ئەمیش لەم نێوانەدا، هێزێک لە ناخیدا بەرەو سووتانەکە ڕای دەکێشا، جوانی و ڕووە سەوزەکەی لاکەی تریش بەرەو لای خۆی ڕای دەکێشا. نەیدەزانی کامیان هەڵبژێرێت. خۆی لە دڵەوە پێی خۆش بوو لایە سەوزەکە هەڵبژێرێت، بەڵام دەنگەکەی ناخی، کە دەنگی مرۆڤ بوو، نەیدەهێشت.

دیمەنی زۆر سەیر دەهاتنە بەرچاوی. خەونەکانی هێندە ئاڵۆز بوون، هەرگیز بۆی لێک نەدەدرانەوە، کەچی کاتی خۆیشی، لەسەر خەون پشتی لە ئاوەدانی کرد. لە دیمەنێکدا لە لایە سووتاوەکەی دارستانەکە، دوو لەشکری گەورە لە بەردەم یەکدا وەستابوون. لە ناوەڕاستی لەشکرەکانی هەردوو بەرەکەدا، چەند ئەسپسوارێک وەستابوون. دوای کەمێک، ئەسپسوارەکان شمشێرەکانیان دەر دەهێنا و پڕبەدەم هاواریان دەکرد بۆ پێشەوە. لە چاوتروکانێکدا لەشکرەکان دەیانداً بەیەکدا و ئەو ناوە، بە لقی درەختەکانیشەوە، پڕ دەبوو لە خوێن و سوور هەڵدەگەڕا.

(زەوی کاتێک وێران دەبێت، خۆشەویستیی ناو دڵەکان نامێنێت.)

هێندە بەحەشمەتەوە بەرەو یەکتری ڕایان دەکرد، کاتێک بەر یەک دەکەوتن، چاوی خۆی دەنووقاند. بەرگەی

نەدەگرت سەیری ئەو بەریەککەوتنە توندەی شەڕکەرەکان بکات. لێ ئەوان بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە بەرەو ڕووی یەکتری دەچوون!

# (١١)

**بە زەڕینی کەرەکە خەبەری بوویەوە.**

ئاسمان ڕوونی کردبوو. لەناو تێشوەکەی مشتێک کوتە[١]ی دەر هێنا. بەیانییان تۆزێک بخۆ، ئیتر تا ئێوارە بێخەم برسیت نابێت، هەم لە گەرما دەتپارێزێت، هەم لە سەرما. ئەمیش بەیانییان کەمێکی دەخوارد و ئیتر باکی بە برسێتی نەدەبوو.

خۆی کۆ کردەوە و کۆپانەکەی دا بەسەر پشتی کەرەکەدا و کەلوپەلەکانی دایەوە بەسەر کەرەکەدا و کەوتنەوە ڕێ. هەر هەنگاوێک دەینا، دوورکەوتنەوە بوو لە تەنیایی و نزیککەوتنەوە بوو لە ئاوەدانی. ماوەیەک ڕۆیشتن، لە چەمێک نزیک بوونەوە، چەمەکە ئاوی زۆر بوو نەیاندەتوانی بەئاسانی بپەڕنەوە. لە دەرەتانێک دەگەڕا ببپەڕنەوە، سوودی نەبوو. دارێکی هێنا خستیە ناو چەمەکەوە و دارەکە گیر بوو لە بەردەکان. خۆی دەستی گرت بە دارەکەوە و کەرەکەشی

---

١ کوتە: قەزوان و کاکڵەی گوێز و تووە، پێکەوە دەکەیتە ناو هاوەنێک باش دەیکوتیت. هێندە دەیکوتیت تا هەرسێکیان پێکەوە تێکەڵ دەبن و وەک بنێشتی لی دێت. سەردەمانی زوو قافڵەچییەکان و ڕاوچییەکان بەکاریان دەهێنا.

بەشوێن خۆیدا ڕادەکێشا. هەرچەندە ئاوەکە فشاری دەخستنە سەر، بەر دارەکە دەکەوتن و ئاو نەیدەبردن. بە هیلاکییەکی زۆرەوە توانییان بپەڕنەوە. هەموو گیانیان خووسابوو. باشییەکە لەوەدا بوو ڕۆیشتنەکەیان بەرەو گەرمیان بوو، پشتیان لە کوێستانان بوو. بەتەڕی ڕێگای خۆیان بەر نەدا.

لە هەندێک شوێن چڵەگیاکان زەرد هەڵگەڕابوون. وەرزەکەشی وەرزی کۆتاییهاتنی باران نەبوو، لەوانەیە هیی ئەوە بێت، پەلکەگیاکان زۆر ناسکن و بەرگەی تیشکی خۆریکی تیندار نەگرن. لەناو گیا سەوزەکاندا، پەلکەگیایەکی زەرد، دەنگی پیرییە.

ئەوەندە لە کێوەکان دوور کەوتنەوە، کە سەیری دواوەی دەکرد، بەحاڵ کێوەکان دیار بوون. لە خۆیشی نەدەپرسی بۆچی بڕیاری دا بەرەو ئاوەدانی بچێت. دەنگێک لە ناخیدا بانگی دەکرد، ئەو دەنگە یەکێک بوو لەو دەنگانەی لەوەتەی تەنیا بوو، وازی لێ نەدەهێنا.

(مرۆڤ هەوڵی زۆر دەدات خۆی بنوێنێت، هەوڵەکانیشی بێسوودن و لە کۆتاییدا تێدەگات، ئەو مرۆڤە، شتێکی دیکە نییە.)

هەرچەندە ماوەیەکی زۆر خۆی دوور خستەوە، لە کۆتاییەکەیدا بارگەی خۆی پێچایەوە. گومانیشی لەوە نەبوو هاتنەکەی بۆ ئاوەدانی، بەبێ پەیام نابێت. خودا بکات وەک جاری پێشوو ئاژاوەیەک بەشوێن خۆیدا نەهێنێت.

## (١٣)

**گەیشتنە ناو بێستانێکی کاڵەک.**

بێستانەکە هێشتا تازە گەڵای دەر کردبوو. لەو ناوچەیە گەرما وا تینی هێنابوو، بێستانەکان خەریک بوو کاتی گوڵکردنیان دەهات. چاوی بەناو بێستانەکەدا دەگێڕا، تەرزەکانی بەسەر زەوییەکەدا خشابوون و نەرمەگەڵای سەوزی کاڵیان دەر دابوو. لەناویشیاندا هەبوو، لە ناوەڕاستدا گوڵێکی سپی، کە ئەمیرەیەکی زەردی تێدا بوو، دەمی کردبوویەوە. کە سەری بەرز کردەوە، لە دوورەوە تارمایی مرۆڤێک دەر کەوت.

(مرۆڤ تارماییەکەی جوانترە لە خۆی.)

بەرەو تارماییەکە ڕۆیشت. نزیک بووەوە، جووتیارێک بوو خەریکی بژارکردنی بێستانەکەی بوو. سڵاوێکی لێ کرد و ئەویش سەری بەرز کردەوە و وەڵامی دایەوە. جووتیارە بە ڕوویەکی خۆشەوە بەرەو پیری هات، فەرمووی لێ کرد پێکەوە لەژێر ئەو کەپرە بچووکە دانیشن چایەک بخۆن. کە ناوی چای هێنا، ئەژنۆی شکا. ساڵانێکی زۆر بوو

چای نەخواردبوویەوە. بێچایی لەو کێوانە تووشی دەردی ژانەسەری کردبوو. هەفتەیەک تێنەدەپەڕی سەری ژان نەکات.

ناوی چایەکە وای لێ کرد بەبێدەنگی لەگەڵ جووتیارەکە بەرەو کەپرە بچووکەکە ڕۆیشتن و جووتیارە خەریکی لێنانی چایەکە بوو. کاتێ دەمکردنی بۆنێکی خۆشی لێوە دەهات، بۆنەکەی وای لێ کرد لە خۆشیدا چاوی داخات و بۆن بکات.

چایەکی بۆ تێکرد. کە کلۆشەکرەکەی خستە دەمیەوە و لێوی نا بە پیاڵە باریکە بەتەختەدروستکراوەکەوە، گەرمایەکی زۆر بەر لێوی کەوت و چزەی لێ هەڵساند. گوێی بە سووتانی لێوی نەدا و چایەکەی هەڵقوڕاند. تامێک بەناو دەمیا بڵاو بوویەوە، ساڵانێکی زۆر بوو ئەم تامەی نەکردبوو. جووتیارە زانی ڕێبوارەکە تامەزرۆی چایە، دوای تەواوکردنی، دانەیەکی تری بۆ تێکرد. ئەویش بەبێ وەستان دەیسانەوە هەڵی قوڕاندەوە. هەستی کرد سەری گێژ دەخوات! بەڵام تامەکەی هێندە پێ خۆشبوو، گەر مەستیش ببووایە، باکی پێی نەدەبوو و دەیخواردەوە.

دوای چایەکان جووتیارە لێی پرسی، "کاکی ڕێبوار لە کوێوە هاتوویت."

"لە کێوەکانەوە!"

جووتیارەکە گوتی، "بۆ لە کێوەکانەوە؟"

"مەنزڵی من لەناو کێوەکانە."

"فزوولی نەبێت، ئەتوانم بپرسم بۆ؟"

"چونکە بێزار بووم لە خراپەی مرۆڤەکان، بۆیە کێوەکانم هەڵبژارد."

"یانی بە دووری لە مرۆڤەکان، چاکە دێت؟"

"نا، چاکە نایەت، بەس خۆ دەتوانی لانی کەم دوور بیت لەو خراپییە."

جووتیارەکە باش تێنەگەیشت و لەسەری نەڕۆیشت. بەبێدەنگی دانیشت و کەمێ سەیری کرد، وەک دێوانەیەک هاتە بەرچاوی. ئەویش زانیی جووتیارەکە جۆرێکی تر لێی دەڕوانێت، ماڵئاوایی لێ کرد.

## (١٣)

**نیوەڕۆ بوو.**

لە دوورەوە کۆمەڵێک جووتیار دیار بوون، خەریکی کێڵانی زەوییەکەیان بوون.

بەتەنیشت جووتیارەکاندا تێپەڕی. بەسەرسامییەوە سەیریان دەکرد. تەنها دەستێکی بۆ بەرز کردنەوە و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە. لەخوار ئەوانەوە شۆڕەبییەک لار بووبوویەوە. بەرەو شۆڕەبییەکە داچوو. کانییەک لەژێر شۆڕەبییەکە هەڵدەقوڵا. بارگەی خۆی خست و خۆی و کەرەکەی ئاویان خواردەوە و خۆی فێنک کردەوە. دیسانەوە ژەمێک نان و شەرابی خوارد. تاوێک لەژێر سێبەری شۆڕەبییەکە پاڵ کەوت، بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، خەو چوویە چاوەکانی.

لە خەوەکەیدا، شەڕی دوو لەشکرەکە گرمەی دەهات. ئەسپسوارەکانی هەردوو لا، کە لە ناوەڕاستی لەشکرەکەدا وەستابوون، دەستیان ڕادەوەشاند. پێدەچوو فەرماندەکانیان بن و هانیان بدەن یەکتری بکوژن. شەرکەرەکان زۆر بێرەحمانە کەوتبوونە وێزەی یەکتری. شمشێرەکانیان دەکێشا

بە گیانی یەکتریدا، لە هەر شمشێروەشاندنێکدا، سەرێک، قاچێک، دەستێک دەپەڕی و خاوەنەکەی هاوارێکی لێ بەرز دەبوویەوە.

(جاری وا هەیە مردن فریای شەڕەکانی مرۆڤ ناکەوێت.)

سەیری ئەمبەری کرد، بینیی چی گیانەوەر هەیە، بە چوارپێ و باڵندە و خشۆکەوە، لەسەر لێوارەکە وەستاون و بەسەرسامییەوە سەیری شەڕی مرۆڤەکان دەکەن. حەپەسانی گیانەوەرەکان لە بەردەم شەڕەکەدا چاویانی وا ڕاکێشابوو، سەد هاوارت بکردایە هیچیان ڕانەدەچڵەکی.

دوای یەکترکوشتنێکی زۆر، هەردوو لا پاشەکشێیان کردەوە بۆ لای ئەسپسوارەکان. ئەمیش لەتەنیشتیانەوە بەوردی چاوی لێیان بوو. کەمێک ماندوویێتیی خۆیان دەر دەکرد و دیسانەوە دەستیان پێ دەکردەوە. ناو دارستانە سووتاوەکە پڕ دەبوو لە تەرم، پڕ دەبوو لە هاوار و ناڵە و خوێن. کەسێک لەناو ئەوانەدا نەبوو بەزەییی بەوی تردا بێتەوە. تێنەدەگەیشتن ئەم شەڕە خوێناویانە لەپێناو چیدا دەکرێن.

(مرۆڤ لەبریی عەقڵی، پشت بە هێزی خۆی ببەستێت، لەدوای خۆی جگە لە وێرانە، شتێک جێ ناهێڵێت.)

چەندە هەوڵی دەدا سەری بسووڕێنێت و تەماشای شەڕەکە نەکات، نەیدەتوانی. تەنانەت لەناو خەونەکەشدا، دەنگەکەی ناخی بانگی دەکرد ئەویش بەتەنیا نەوەستێت و سەیرکەر بێت، شتێک بکات شەڕەکە بەلای یەکێکیاندا بشکێتەوە!

# (١٤)

**دەمەوئێوارە خەبەری بوویەوە!**

سەری سوور ما لەوەی بۆچی ئەمڕۆ بەبێ ماندووبوون، بەو شێوەیە خەوی لێ کەوتووە. پێدەچێت هۆکەی ئەوە بێت، لە ئاوەدانی نزیک بووەتەوە. بەپەلە خۆی پێچایەوە تا ئەمشەویش لەم چۆڵەوانییە نەبێت، تا نزیک کەوتەوە لە گوندێک، تاریکی کرد. چرای ماڵە گوندییەکان داگیرسابوون. ویستی بەرەو ڕوویان بچێت، گوێی لە دەنگێکی بەرز بوو لەناو گوندەکەوە بەرز دەبوویەوە. وەستا تا بزانێت ئەو دەنگە چییە. دەنگی مەلایەک بوو.

(ئەم گوندە بەو دەنگە ژەهراوی بووە.)

لەبەر خۆیەوە ئەمەی وت و لای نەدا و بەتەنیشت گوندەکەدا تێپەڕی. کاتی خۆی یەکێک بوو لەو کەسانەی لە شارە بچکۆلانەکەی خۆیان، بە گەنجە هوشیار و خوێندەوارەکە ناسرابوو. مێژووی هەزاران ساڵی ژیانی شارستانییەتەکانی خوێندبوویەوە. لەناو حوجرەکان فێری چەندین زمان بووبوو. هەوڵی زۆری دەدا گەنجەکان پشت لەو ژیانە بێهودەیە بکەن

و ڕوو بکەنە کتێبەکان. کەچی گەنجەکان هەر خەریکی کاری پڕوپوچ بوون و گاڵتەیان پێ دەکرد. مەلاکان بەمەیان زانی و وەک لادەرێک ناویان دەهێنا. ئیدی لە هەرشوێنێک ناوی مەلایەکی ببیستایە، دەیگوت، "ئەم شوێنە ژەهراوی بووە."

هێشتا لەسەر باوەڕە کۆنەکەی خۆی مابوو. بڕوای وا بوو هەتا مەلاکان بینە دەمڕاستی خودا و ئیمان، خودا و مرۆڤ، خودا و ژیان، مرۆڤ بەخەبەر نایەت. ئەوان بۆ ئەوەی بوونەتە مەلا، وەک بێشکەیەک چۆن منداڵێک دەخەوێنێت، ئاوا مرۆڤ لە بێئاگاییدا بخەوێنن. هۆی لانەدانی لە گوندەکەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوە، مادام گوندنشینەکان گوێ لە مەلایەک دەگرن، واتای ئەوەیە خەیاڵ و بیرکردنەوەیان ژەهراوی بووە و کەڵکی نزیکبوونەوەیان نییە.

کێشەیەکی گەورەی لەتەک گەیەنەرانی ئایینیدا هەبوو. لە مێژووە کۆنەکاندا خوێندبوویەوە، هەرچی گەیشتە دەمی مرۆڤ، نیوەی بەڕاستی دەگەیەنێت. ئیتر ئەم چیرۆکی نیوەڕاستییە بوو بە ملۆزمێک و بڕوای بە زۆر شتی مرۆڤەکان نەما. هەمیشە لای هاوڕێ گەنجەکانی باسی لەوە دەکرد، زمان بنەوانی کێشەکانە. تا ئەم زمانە چاک نەکرێت، جوان نەکرێت، سەرلەنوێ دروست نەکرێتەوە، شتەکان وەک خۆیان ناگەن.

گوندەکەی تێپەڕاند و ئەستێرەکان دەر کەوتنەوە. لە ڕێی گوندەکە بەرەو شارە بچووکەکە، چەند باخێکی سێوی لێ بوو. لە یەکێک لە باخە سێوەکان لای دا و شەوی تێدا بەسەر برد.

(مرۆڤ دەبێت هەمیشە بەرگری لە خۆی بکات و نەهێڵێت

بڕواکانی پیس ببن.)

لەژێر دارسێوکدا کەلوپەلەکەی خۆی خست و بەئارامی بۆی پاڵ کەوت. کەرە بۆرەش لەولایەوە تاوێ گیای خوارد و دوای تاوێ تەپوتلێکی کرد و بۆی ڕاکشا.

# (١٥)

بەیانی بەرەو شارە بچکۆلەکە ڕۆیشت.

لەنزیک شارەکە پیاوێکی کامڵ، نە پیر، نە گەنج، لەتەنیشت ڕێگاکە پاڵ کەوتبوو. لە پیاوەکە نزیک بوویەوە، بینیی خەوتووە. (ئێوە دەمێکە خەوتوون.) حەزی دەکرد بەخەبەری بهێنێت. دەنگەکەی ناو سەری هاواری کرد بەسەریدا. (ئەوانەی خەوتوون بەخەبەریان مەهێنە، لەوانەیە بەخەبەریان بهێنیت یان ببن بە بکوژ، یان ببن بە کۆیلە.) دەستی بردبوو ڕای وەشێنێت، دەستی گێڕایەوە و وازی لێ هێنا و بەرەو دەروازەی شارەکە ڕۆیشت.

لە یەکەم هەنگاوی بۆ ناو شارەکە، دوو کۆڵبەر بە قولاپەکانی دەستیانەوە پەلاماری یەکتریان دەدا. خەڵکەکەش بەبێ ناوبژییەک بەپێکەنینەوە سەیریان دەکرد و چێژیان لەوە دەبینی یەکێکیان قولاپەکە گیر بکات لە قوڕگی ئەوی تریان. کەوتە نێوانیان و هەرچۆنێک بێت جیای کردنەوە. خەڵکەکە سەریان سووڕ ما، پیاوێکی بەتەمەنی مێزەربەسەری عابالەشان لەو ناوە پەیدا بوو، نەیهێشت ئەوان چێژ لە

بینینی شەڕەکە ببینن.

(زۆرینەی خەڵک بۆ چێژ دەژین.)

دەستی هەردوو کۆڵبەرەکەی گرت و بردنیە کەنارەوە. لێیانی پرسی بۆچی شەڕ دەکەن؟ هەریەکەیان خۆی بە خاوەن حەق دەزانی. ئەویش تێگەیشت شەڕەکەیان لەسەر گواستنەوەی کۆڵێکە، بەزەردەخەنەوە پێی وتن، یارمەتیی یەکتری بدەن، باشتر نان پەیدا دەکەن، وەک لەوەی شەڕ بکەن و نانی یەک بخۆن. کێشەی ئێوە زمانتانە، زمانتان لاوازە بۆ دەربڕین، بۆیە ناتوانن یەکتری تێبگەیەنن.

دوو کۆڵبەرەکە تووڕە بوون لە یەکتری. بەو ئاسانییە نەدەهاتنەوە سەرخۆیان. خەڵکەکە بڵاوەیان کرد، ئەمیش زۆر لەگەڵیان نەمایەوە و بەرەو بازاڕی شارە بچکۆلەکە چوو. زۆربەی دوکانەکان بچکۆلە بوون، بە دار دروست کرابوون. ئەو کەلوپەلانەی لە بازاڕەکەدا بوون، بەشێکی زۆریان ئەو کەلوپەلانە بوون کە ئەم لە کێوەکان بە دەستی خۆی بۆ خۆی دروستی کردبوون. لە جیاکردنەوەی دوو کۆڵبەرە شەڕکەرەکەدا تێگەیشت، هاتنی ئەم بۆ ئاوەدانی، ئامانجێکی هەیە. کە وایە دەبێت ئەو ئامانجەی لەبیر نەکات و بەردەوام بێت لەسەری.

(تەنها خەونت هەبێت، ئامانجیشت هەیە.)

سەیری لێ هات دوو کۆڵبەری هەژار نیشتبوونە سەر یەک. دایمەی خوا هەژارەکان شەڕەکان دەکەن و دەستەیەکی خاوەن داراش، بەرهەمی شەڕەکە دەخۆن.

(گەر زمان هەبێت بۆ تێگەیشتن، شەڕ ڕوو نادات.)

# (١٦)

**بازاڕەکە شلۆق بوو، جمەی دەهات.**

کڕیارەکان لەدەوری شتومەکەکان کۆ بووبوونەوە. یەکێک لەناو هەموو فرۆشیارەکاندا بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد، وەرە سێو بەرەوە. ئەو سێوە جوانەی ئادەمی لەسەر دەر کرا. تەنها تامی بکەیت، لەم دونیایەش دەر دەکرێیت.

گوێی لە هاوارەکانی بوو، دەستی کرد بە پێکەنین. دەمێک بوو گوێی لە درۆکان نەبووبوو. کە دەیبینی خەڵکەکە دەوری کابرای فرۆشیاریان داوە، بەپێکەنینەوە بە کەرەکەی خۆی وت، "هیچ شتێک هێندەی درۆکردن مرۆڤ لەدەورت کۆ ناکاتەوە."

ڕاستی دەکرد، خەڵکەکە خۆشباوەڕ بوون، دەتوانی بە هاوارێکی ناڕاست کۆیان بکەیتەوە، کەچی لە بەردەم ڕاستییەکدا هەزار گومانیان دەخستە مێشکی خۆیانەوە. هەر لەویادا هاوارت بکردایە ڕاست نییە، سێو هەر سێوە، لەوانەیە پەلاماریان بدایتایە. حەزیان لە درۆکردن بوو. ئەم لە جێگای خۆیەوە درۆکردنەکە هێنابوویە پێکەنین. کەچی خەڵکەکە

هێندە شەیدای پیاهەڵدانە ناڕاستەکە بوون، بە چاوتررووکانێک سێوی فرۆشیارەکەیان کڕی. ئەویش پارەکانی خستە گیرفانی و لە ناوەڕاستی کەپرەکەدا بسکەی سمێڵەکانی دەهات.

(ئەم خەڵکە خراپ ژەهراوی کراون.)

دەبێت پێش ئەوەی پارە دروست ببێت، بازاڕ هەبووبێت؟ دەبێت کە یەکەم جار بازاڕ دروست بوو، چۆن بووبێت؟ لە مێشکی خۆیدا ئەم پرسیارانەی دەکرد. ئەیزانی بازاڕ گەورەترین فریودەری مرۆڤە. هەر کاڵایەک و هەرخۆراک و کەرەستەیەک کەوتە بازاڕەوە، بەشێکی کاڵا و خۆراکەکە فریودەرانەیە. جا وەرە لەم سەردەمەدا بازاڕ بەم گەورەیییە، لە شارێکی بچکۆلانەی وەک ئەم شارە، ئەم بازاڕەی هەبێت، دەبێ لە شارە گەورەکاندا چی ڕوو بدات.

(هەتا بازاڕەکان گەورەتر بن، فریودان گەورەترە.)

نیگەران نەبوو لە بینینی ئەو دیمەنانە. سوپاسی خۆی دەکرد هێشتا نەبووەتە کەسێک بازاڕ بتوانێت فریوی بدات. ڕازی بوو، بە کەوا کۆنەکەی و مێزەرە کاڵەوەبووەکەی، لەتەنانێک و قومێ شەراب و چنگێک (کوتە)ی پێ بووایە، گرنگیی بە هیچی دیکە نەدەدا. هەر لە قەراغ شارەکە دەیان باخی سێوی لێ بوو، شارییەکان لەبریی پەلاماردانی سێوفرۆشێک، بچوونایە لەو باخانە تێریان دەخوارد و بە سەبەتەش دەیانهێنایەوە، لێ پێدەچوو هونەرەکە لە هاوارە فریودەرانەکەدا بێت، نەک لە سێوەکاندا، بۆیە لێی گرد بوونەوە.

## (١٧)

**لەتەنیشت گۆزەکەرێک وەستا.**

لـە بـەردەم دوکانەکەیـدا لەسـەر بەردێـک دانیشـت. گۆزەکەرەکـە پارچەقوڕێکی خسـتبوویە سـەر ڕەوڕەوەکـەی و دەسـتی دەهێنـا بـە شـانوملی قوڕەکـەدا. بەبێ ئـەوەی سـەری بـەرز بکاتـەوە، وتـی، "مامـە پیـرە تـۆ لـە گۆزەکـڕ ناچیـت!" ئەویـش لـە وەڵامـدا وتـی، "ڕاسـت دەکەیـت. مـن کڕیـار نیـم، ڕێبـوارم و کەمێـک مانـدووم، دوکانەکـەی تـۆم کـردە شـوێنی حەوانـەوەم، گـەر پێـت ناخـۆش نەبێـت."

گۆزەکـەر سـەری بـەرز کـردەوە و بەئەسـپایی تەماشـای کرد. لەگەڵ تەماشـاکردنـدا زوو زوو دەسـتە قوڕاوییەکانی خۆی دەژەند بـە ئـاوی نـاو قاپەکـەی تەنیشـتی ودیسـان دەسـتی بـە قوڕەکەدا دەهێنایـەوە. خـەریک بـوو قوڕەکـە ملێکی بـەرزی بۆ دروسـت دەبوو. بـەدەم کارەکەیـەوە کەوتـە قسـەکردن لەگەڵی:

"ئەزانـی مامـە پیـرە، ژیـان وەک گـۆزە وایـە، خـۆت چۆنـی دروسـت دەکەیـت، بـەو جـۆرە دەر دەچێـت!"

وەڵامی نەدایەوە، ئەویش بەردەوام بوو لە قسەکانی خۆی، "ئەم شارەی ئێمە شارێکی سەرسوورهێنەرە، گەرچی بچووکە، کەچی بەم بچووکییەی خۆیەوە زۆر دڵگیرە. من خۆم گۆزەکەر نەبووم، لای یەکێک لە وەستاکان فێر بووم، لەو ڕۆژەوەی دەستم چووەتە ناو ئەم قوڕەوە، هۆگری بووم. ڕاستییەکەی، هۆگری هەرشتێک ببیت، ئەبێت بە بەشێک لە ژیانت، تەنانەت ئەو شتە پارچەقوڕێکیش بێت. ژیانم بەبێ قوڕ شتێکی کەمە. بیر لەو حیکایەتە کۆنە دەکەمەوە کە خۆمان لە قوڕ دروست کراوین، هەست دەکەم گاڵتەجاڕییە و لەوانەشە عەقڵی من لەوە لاوازتر بێت و گاڵتەجاڕی نەبێت. چۆن دەبێت لە قوڕ دروست کرابین؟ ئەی بۆ نابێت؟ ئەوە نییە من بە قوڕ گۆزە و کووپ و چەندین شت دروست دەکەم. بۆ نابێت خولقێنەرێکیش مرۆڤی لێ دروست کردبێت. وا نییە، مامە پیرە؟"

دیسان وەڵامی نەدایەوە. گۆزەکەرەکە زانیی ڕێبوارەکە قسەکەر نییە، خۆی وەڵامی خۆی دایەوە و وتی، "نامەوێت زۆر سەرت بێشێنم، ئەزانم ماندوویت. بەم دەستە قوڕاوییانەشەوە ناتوانم قومێک ئاوت بدەمێ، گەر ئەرک نەبێت خۆت هەڵسە لە ژوورەوە مەرکانەکە ئاوی ساردی تێدایە، دەمت تەڕ بکە.

وەڵامی نەدایەوە و بەبێدەنگی سەرێکی کرد بەناو دوکانەکەدا، تا بنمیچی دوکانەکە گۆزەی جوانی جۆراوجۆر هەڵچنرابوون. لەناو مەرکانەکە دۆلکەیەک ئاوی دەر هێنا و بەدەم خواردنەوەی ئاوەکەوە لە گۆزەکانی ڕوانی.

هاتە دەرەوە و ڕەشووی کەرەکەی گرت و بەر لە خوداحافیزی بە گۆزەکەرەکەی وت، "ژیان هەمیشە هەنگاوێک لەپێش مرۆڤەوەیە."

خوداحافیزیی لێ کرد و ڕۆیشت.

# (١٨)

**گوڵفرۆشێک لەوبەری گۆزەکەرەکەوە بوو.**

ویستی تێی پەڕێنێت، جوانیی گوڵەکان وەستاندیان. شێوازی دانانیان تەواو سەرنجڕاکێش بوو. بە شێوەی پلیکانە گوڵەکان لەناو فنجانی بچوکەلە بچکۆلەدا، لەتەنیشت یەکەوە دانرابوون و بۆ سەرەوە هەڵچنرابوون. ڕیزێک گوڵی زەرد و لە ناوەڕاستیاندا گوڵێکی سوور، ڕیزێک گوڵی سوور و لە ناوەڕاستیاندا گوڵێکی زەرد. هەرکەسێک بەو ناوەدا تێدەپەڕی، خۆی نەدەگرت و سەیرێکی دەکردن. کابرای فرۆشیاریش بە خۆی و مێزەرێکی گەورەی سەری و سمێڵێکی قیتەوە، لە ناوەڕاستیاندا کورسییەکی دانابوو، قاچی خستبوویە سەر قاچ. کە بینیی ئەم لە بەردەم گوڵەکاندا سەراسیمە وەستابوو، بەگاڵتەپێکردنێکەوە پێی وت، "تۆ تەمەنی ئەم شتە جوانانەت نەماوە!"

ئەمیش وەڵامی نەدایەوە و لە جوانیی گوڵەکان ڕادەما. کابرای فرۆشیار دیسانەوە بەتانەلێدانەوە دەستی کردەوە بە قسەکردن، "دەبایە لە کاتی جوانیتدا جوانییەکان سەرسامت

بکەن."

ئەم قسەیە ئازاری پێ گەیاند و ناچار وتی، "لەناو هەموو جوانییەکدا، ناشیرینییەک هەیە." ڕێک مەبەستی ئەو بوو لەناو گوڵەکاندا دانیشتووە.

کابرای فرۆشیار لە قسەکەی تێگەیشت و کپ و کڕ سەری خۆی داخست. ئەمیش وەک بڵێی دەمێکە جوانیی لەو جۆرەی نەدیوە، لە بەردەمیاندا وەستابوو. دەنگەکەی ناخی پێی وت:

(ئەوانە جوانیی کاتین، بۆ جوانییەک بگەڕێ هەمیشەیی بێت.)

یەکەم جار بوو ئەو دەنگە شتێکی باشی پێ بڵێت. بەڵام ئەم نارازی بوو لێی و بە خۆی وت، "جوانی گەر بۆ ساتێکیش بێت، هەر جوانییە." لەم کاتانەدا کەرەکەی هەتا هێزی تیا بوو دەستی کرد بە زەڕین. زەڕینەکەی ڕای چڵەکاند. کەچی خەڵکی ناو بازاڕەکە گوێیان نەدایە. سەیرێکی خەڵکەکەی کرد، سەرەتا وا تێگەیشت بە دەنگەکەی بێزار بن، کە زانیی بێزار نابن، وەستا تا لە زەڕینەکەی بوویەوە و بەشوێن خۆیدا ڕای کێشا و ڕۆیشت.

(زۆربەی خەڵک بە دەنگی حەقیقەت بێزار دەبن.)

گوڵە جوانەکان لە بەرچاوی نەدەڕۆیشتن و سەیری هەرلایەکی دەکرد، یەکێک لە گوڵەکان دەهاتەوە بەرچاوی. جوانی شتێک نییە پەیوەندیی بە تەمەنەوە بێت. پیرترین مرۆڤی دونیا دەتوانێت هەمان ئەو جوانییە ببینێت، کە گەنجترین مرۆڤ دەیبینێت.

# (١٩)

**ئێواره نزیک بوویەوە.**

منارەی مزگەوتێک دیار بوو. بەرەو منارەکە چوو.

گەیشتە بەردەرگاکەی و خۆی کرد بە ژووردا. مزگەوتەکە حەوشەیەکی گەورەی تیا بوو. لەتەنیشت دەستشۆریەکان، حەوزێکی پڕ لە ماسی، دارتوویەکیش پڕ لە هێلانەی چۆلەکە خۆی دابوو بەسەر حەوزی حەوشەکەدا. لە دەرەوە کەرەکەی جێ هێشت. دوای خۆتەکاندن و شوشتنی قاچوقولی، لای حەوزەکەوە لەژێر سێبەری دارتووەکە دانیشت. کەمێک برسیی بوو، بەڵام بیری لەوە دەکردەوە غەریبە بەم شارە، شەو چی بکات؟

یەکێک لە مزگەوتەکەوە هاتە دەرەوە. سەرەتا زۆر گوێی پێ نەدا، کاتێک زانیی بەرەو ڕووی ئەم دێت، سەری بەرز کردەوە، پیاوێکی پیری پشتچەماوە بوو. بەبێ سەلام و کەلام وتی، "ئەمە تۆیت... ئەمە تۆیت میرزای باڵدار!"

کە سەری بەرز کردەوە، یەکێک لە هاوڕێ کۆنەکانی خۆی بوو. ئەمیش بەزەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە، "ئەمە

تۆیت... ئەمەتۆیت... ژەهراوی کراویت!"

دەستیان کردە ملی یەکتری و دانیشتن باسی خۆیان بکەن. هەرچەندە ئەم پێی خۆش نەبوو باسی خۆی بکات، کە چی دەکات و لەکوێیە، ئەما هاوڕێکەی نەیبڕییەوە. هەر لەو ڕۆژەوەی یەکیان ناسیبوو، تا ئەو ڕۆژەی میرزای باڵدار شاری جێ هێشتووە، هەمووی گێرایەوە. میرزا هەر گوێی دەگرت و سەری بۆ دەلەقاند. لە گەرمەی قسەدا بوو، کەرەکە لەودیو دەرگای حەوشەوە دیسانەوە تا هێزی تیا بوو زەڕاندی. لەگەڵ زەڕینی کەرەکە میرزای باڵدار وتی، "ئەو دەنگە پاکتر و خۆشترە لە دەنگی مرۆڤی ژەهراویکراو."

هاوێکەی لە دڵی گران بوو، بەس نەیویست دەری بخات. دوای قسەکەی ئەویش بێدەنگ بوو. ماوەیەک بەبێدەنگی سەیری ماسییەکانی ناو حەوزەکەیان کرد. ئینجا هاوڕێکەی پێی وت، "ئەزانم غەریبی بەم شارە، ئەمشەو میوانی من بە." میرزاش هیچی نەوت و بێدەنگییەکەی نیشانەی ڕازیبوونی بوو. پێکەوە چوونە دەرەوە و ڕەشووەی کەرەکەی گرت بە دەستیەوە و بەرەو ماڵی هاوڕێکەی . پێش گەشتن بە ماڵیان، سەری لە گوێچکەی کەرەکەی نزیک کردەوە و چرپاندی بە گوێیدا:

(بەڕاستی من نەک بەم شارە، بەم مرۆڤە ژەهراویکراوانەی ئەم سەردەمەش غەریبم.)

## (٢٠)

**پێش خۆی ناوبانگی گەیشتبوو.**

میرزای باڵدار ناوێکی کۆنی ئەو بوو. لە گەنجیدا هێندەی لەسەر باڵندەکان خوێندبوویەوە، بە دەستی خۆی کتێبێکی لەسەر نووسیبوون. لەسەر بەرگی کتێبەکە لەباتیی ئەوەی ناوی خۆی و باوکی بنووسێت، نووسیبووی میرزای باڵدار. دوای کتێبەکە ئەو ناوە بڕا بەسەریدا، بەڵام ئەوەی ئاژاوەکەی بۆ دروست کرد، کتێبی *خەونە باڵدارەکان* بوو. ئەو کتێبەی وای لێ کرد چی ئایینپەروەر و چی کۆنەپەرستی سەردەمی خۆی بن، دەمی لێ بکەنەوە. لەو کتێبەدا باسی ئەو خەونانەی کردبوو، کە باڵیان هەیە و مرۆڤ لە سەرزەمینێکەوە دەبەن بۆ سەرزەمینێکی تر. باسی لەو خەونانە کردبوو، کە تەنانەت مرۆڤی بێدەستوپێش دەتوانێت بفڕێت و دوور بکەوێتەوە لەو ژیانە کۆنەی تێیدا دەژیت.

پاش ئەوەی شارەکەشی جێ هێشتبوو، خەڵکەکە چیرۆکی سەیرسەیریان لەسەر دروست کردوو. هەندێک دەیانوت، بەرەچەڵەک دەچێتەوە سەر ئەو پەیامبەرەی لە زمانی

باڵندەکان تێگەیشتووە. هاوڕێیەکیشی بۆ خۆهەڵکێشان لەناو چایخانەکاندا باسی لەوە کردبوو، گوایە چەندین جار خۆی گوێی لێ بووە لەگەڵ باڵندەکاندا قسەی کردووە و زمانی هەموو باڵندەکانی زانیوە.

هەر لە منداڵییەوە دایک و باوکی مردبوون. دوای مردنی دایک و باوکی، قەشەیەک لای خۆی گلی دابوویەوە و بەخێوی کردبوو، بەهیوای ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان گەورە ببێت و ببێت بە قەشەیەک و ئایینی ئاشتی بڵاو بکاتەوە. کەچی ئەم هەتا گەورەتر دەبوو، لە ئایین دوورتر دەکەوتەوە. قەشە نەیدەویست ئازاری بدات، بە شێوازە نەرمەکەی خۆی لەسەری دەوەستا و ئامۆژگاریی دەکرد. ئامۆژگارییەکانی لەم گوێیەوە دەهاتن و لەو گوێیەوە دەر دەچوون، تا وای لێ هات قەشە لێی بێزار بوو، بەڵام دەری نەکرد و دەستی لە ئامۆژگاریکردنی هەڵگرت.

میرزای باڵدار کەوتە شوێن کتێب و مێژوو و ناسینی باڵندەکان و گیانەوەرەکان و خەونە باڵدارەکان. کە شارەکەشی جێ هێشت، زۆر کەس بڕوایان وا بوو کەسێکە لە جنسی مرۆڤ ناچێت. هیچ گۆشتێکی نەدەخوارد، لە ژیانیشیدا ئازاری بە مێروولەیەک نەگەیاندبوو. تا بڵێی خوێنەوارێکی قشتی سەردەمەکەی خۆی بوو. دوای بڵاوکردنەوەی کتێبەکەشی، گاڵتەی زۆری پێ دەکرا. خەڵک پێیان دەوت، "ئاخر ماڵکاول لەم هەموو شتە گەورەیەی دونیا، بۆ لەسەر باڵندەکان و خەونە باڵدارەکان دەنووسیت. ئەو بێزمان و بێکەڵکانەی بیانناسی یان نەیانناسی، سوودی چییە؟ ئەوانە بەس بۆ ئەوە باشن بخورێن. خەون چییە باڵی هەبێت یان نا!"

(گەر جوانیی فڕینی باڵندەیەک سەرسامت نەکات، گومان لە جوانییەکانی ناخت بکە.)

ئەوەندە چیرۆکی سەیرسەیریان لەسەر باس کردبوو، تەواوی شارەکە دەیانناسی. خۆ گەر خەڵکەکە بیانزانیبایە ئەم مێژەربەسەرە میرزای باڵدارە، بێشک لێی کۆ دەبوونەوە و پرسیاری چیرۆکەکانیان لێ دەکرد.

## (٣١)

**شەوێکی فێنک بوو.**

هاوڕێیانە پێکەوە لە بەرهەیوانەکە دانیشتن. بەرهەیوانەکە ئەیڕوانی بەسەر حەوشەیەکی پڕ لە تەرەتیزە و پیاز و کەوەر و تەماتەدا. دیار بوو دەمەو بەهاران حەوشەکەی کردووە بە کێڵگەی ئەو سەوزە و میوانەی پێویستن بۆ سەر سفرە. ژنێکی خانومانی دەموچاوسپی، هەرجارە بە شتێکەوە دەهات بۆ لایان. ئێوارەکەی مشتێک برنج و نۆکاوێکی لێنابوو. برنجەکە بۆنێکی خۆشی لێوە بەرز دەبوویەوە. لە کاتی نانخواردندا، دیار بوو هاوڕێکەی هێشتا قسەی ناو حەوشی مزگەوتەکەی بیر نەچووبوویەوە، بۆیە پرسیی، "بۆچی ژەهراوی بووم؟"

"شارەکانی ئەم سەردەمە، چ بچووک بن یان گەورە، مرۆڤ ژەهراوی دەکەن!"

"ئاخر حەز ئەکەم هۆکەی بزانم؟"

"هۆی ناوێت، یەک ڕۆژ کە دەچیتە دەرەوە، ورد بەرەوە لەو ژەهرانەی دەخرێنە ناو خەیاڵ و بیرکردنەوە و ژیانتەوە،

ئەوسا تێدەگەی من باسی چی دەکەم."

"ئەی چارە چییە؟"

"من چارەی خۆمم کرد، تۆش بە ڕێگای خۆت چارەی خۆت بکە."

"من ناتوانم وەک تۆ بکەم. تەنها بۆ شەوێک، بەس یەک شەو، لەو ژنەم دوور بکەومەوە، ئەمرم. بەردەوام لە خەمی ئەوەدام ڕۆژێک پێش من بمرێت. دەبێت ڕۆژێک بەبێ ئەو ژنەم چ ژیانێکی سەخت و پڕئازار بەسەر بەرم. وا مەمبینە زەردەخەنە و ڕووخۆشم، خەمی من ژنەکەمە، ژنەکەم بووە بە هەموو ژیانم، ئەو بڕوات ژیانیشم دەڕوات. تۆ هێشتا نازانی لەگەڵ ژنێکدا بوویت بە یەک جیابوونەوە چ ئازارێکی هەیە."

"بۆ ڕزگاربوون لە ژەهری شارەکان، تەنها ڕێگەی تەنیایی چارەسەر نییە."

"دە باشە تۆ پێم بڵێ، کامە ڕێگا؟"

"من لە ژیانی تۆدا نیم، ڕێگاکانی ژیانی خۆت، خۆت باشتر دەزانی کامانەن."

شتێکی نەوت وردەکاریی تێدا بێت. هاوڕێکەشی دەیویست بەباشی تێبگات و ڕێگا وردەکەشی پیشان بدات. میرزای باڵدار، بە ئارەزوویەکی زۆرەوە نانەکەی دەدا بەسەر برنجەکەدا و بە دەستە زبر و باریکەکانی فشارێکی دەخستە سەری و لەوسەرەوە تیکەیەکی پڕ لە برنجی دەهێنا و بەنەرمی دەیخستە دەمی و کەوچکێکی نوکاویشی دەکرد بەسەریدا.

هەوایەکی فێنێک دەهات، سەر و ملی دەتەزاند. تا درەنگانی شەوێ پێکەوە دانیشتن و باسوخواسی سەردەمەکەیان کرد.

(سەردەمێکە، بێ ئەوەی بە خۆت بزانی، ژیانت ژەهراوی دەکرێت.)

# (٢٢)

**شەو لە بەردەم هەیوانەکە خەوتن.**

خەونی بینی، بۆ یەکەم جار خەودکەی ئەم جارەی جیاواز بوو.

لە خەونیدا کۆمەڵێک کتێب باڵیان هەبوو. (من ئەو کتێبانەم خۆش دەوێن کە باڵیان هەیە.)

هەر کتێبە بەسترابوو بە دەزوویەکەوە و دەزووەکانیش بەسترابوون بە دەستەکانی ئەمەوە، کتێبەکان دەیاندا لە شەقەی باڵ و ئەمیشیان لەگەڵ خۆیاندا ڕادەکێشا. هەندێک کاتیش خەیاڵێکیان پێ دەبەخشی، کە خۆی دەتوانێت بفڕێت. باڵەکانی بەیەکدا دەدان و بەبێ فشارخستنەسەر دەزووەکان، خۆی دەفڕی.

بەسەر کێوەکان، دەشتەکان، باخ و گوند و شارەکاندا دەفڕی، بەرز دەبوویەوە، هێندە بەرز دەبوویەوە، زەوی بچووک دەبووەوە لە بەرچاوی. لەو بەرزاییەوە سەیری زەویی دەکرد، لەناکاو مێروولەیەک دەجووڵا، کە ورد دەبوویەوە، سەیری دەکرد ئەوە مێروولە نییە، مرۆڤە! لەگەڵ

پۆلەکتێبەکەدا بووبوون بە پۆلی باڵدار. خەڵکێکی زۆر، کە لە مێروولە دەچوون، لە خوارەوە سەیری ئاسمانیان دەکرد. بەسەرسامییەوە لە فڕینی پیاوێک و کتێبەکان ڕادەمان، لە هەموو لایەکەوە پەنجەیان بۆ ڕادەکێشا و منداڵانیش بە سادەیی خۆیانەوە بەردیان تێدەگرت و بەردەکانیان نەدەگەیشتنە ئەو.

بەسەر دارستانێکدا فڕین، هەمان ئەو دارستانە بوو لە خەوەکانی تریدا بینیبووی. دارستانەکە دوو بەش بوو، بەشە سووتاو و بەشە سەوزەکە. هەر کە گەیشتنە بەشە سووتاوەکە، یەکێک لە کتێبەکان، کە سەرقافڵەی فڕینەکە بوو، بە دەنگێکی خەمگینەوە وتی، "ئەو دارستانەیان نەسووتاندایە، لانی کەم هەزاران کتێبی پێ دەنووسرا."

(درەختەکان کتێبن، لێیانەوە نزیک بیت، لێیانەوە فێر دەبیت.)

کتێبێکی تر وەڵامی دایەوە، "تۆ ڕاست دەکەی سەرقافڵە... تۆ ڕاست دەکەیت. لەم جیهانەدا باخەوانێک نییە گەمژە بێت، ئەوەشی باخەوانەکان ژێر دەکات، درەختەکانن... بەڵێ، درەختەکانن."

کتێبەکان لەناو خۆیاندا خەریکی باسکردنی درەخت بوون، ئەمیش لە جێگای خۆیەوە شەرمی دەکرد، شەرمی لەوە دەکرد، لەم سەرزەمینە ئەو هەموو شتە باش و جوانە هەیە، بەردەوام مرۆڤ تێکیان دەدات، وێرانیان دەکات، خراپیان دەکات. لە کاتێکدا ئەوەی خاوەنی زەوییە، مرۆڤ خۆیەتی، ئەوەی بەڕێوەی دەبات، مرۆڤ خۆیەتی. کە دەزانێت ئەم سەرزەوییە موڵکی ئەوە، ئیتر بۆ وا بێڕەحمانە دەست لە

جوانییەکان ناپارێزێت.

(زەوی بە مرۆڤەوە ئاوەدانە و هەر مرۆڤ خۆشی وێرانی دەکات.)

# (٢٣)

**چوو بۆ لای بنووسەکە.**

بۆ بەیانییەکەی دوای ناشتایی، بەرەو بنووسەکە ڕۆیشت.

لە گۆشەیەکی بازاڕەکە، دوکانێکی بچکۆلەی بەتەختەدروستکراو، کورسییەک لە ناوەڕاستیدا و دەرگایەکی بچکۆلەی هەبوو، لە دەرگاکەوە دەچوویتە ژوورەوە، لەپشتی دوکانە بچووکەکەوە، دەرگایەکی دیکە هەبوو، لەو دەرگایەشەوە دەچوویتە ژوورەوە، یەک هۆدەی گەورە، کە پڕی بوو لە کتێبی دەستنووس، لەسەر ڕەفەکان دانرابوون. پیاوێکی تەمەنمامناوەندی سمێڵزەرد لەپشت کورسییەکەوە دانیشتبوو، خەریکی تێگرتنی کتێبێک بوو. پیاوەکە هێندە سیغاری کێشابوو، لەگەڵ تووکەکانی لووتی، لە ڕێکی کونەلووتەکانیەوە بۆ خوار، دوو جۆگەلەی زەرد هاتبوونە خوارەوە و هۆدەکەی قانگ دابوو.

لە خۆشیی بینینی کتێبەکان، بیری چوو سڵاو لە پیاوەکە بکا. پیاوەی خاوەندوکانیش گوێی نەدایە و وای زانی هەمان ئەو خەڵکەیە کە ڕۆژانە دێن سەیر دەکەن و لە ژیانیشیاندا

کتێبێک ناکڕن، گەر بیشیکڕن، نایخوێننەوە و لە ماڵەوە لە شوێنێک دادی دەنێن تا خەڵک بێت بیبینێت، تا دەری بخات ئەهلی کتێبە.

بەناو کتێبەکاندا دەگەڕا، چەندین کتێبی ئەمدیووئەودیو کرد. (وای... کتێبەکانی ئەم سەردەمە چەند شتی پووچیان تێدایە.) کتێبێکی بەرچاو نەکەوت بەدڵی بێت. زۆربەی کتێبەکان ژەهرێک بوون بۆ خەوتنی مرۆڤ. بەشوێن کتێبێکدا دەگەڕا ژەهری تیا نەبێت. خەوتنی تیا نەبێت، شەپۆلێک بێت مرۆڤ تا کەناری هوشیاری ببات.

دەستی نەکەوت. لە نائومێدیدا لە ناوەڕاستی هۆدەکەدا وەستا و بیری لە خۆی کردەوە. پیاوە سەری بەرز کردەوە و کە چاوی پێی کەوت، بەشادومانییەوە وتی، "ئەمە تۆی باڵدار؟" ئەویش سەیرێکی کرد و بینیی هەمان ئەو دۆستە کۆنەیەتی، کە لە کاتی فەقێیەتیدا لەسەر کتێبخوێندنەوە گاڵتەی پێ دەکرد. بەپێکەنینەوە پێی وت، "دەبایە بزانم ئەم کتێبە بێکەڵکانە هیی تۆن! تۆ کەی ئەهلی کتێب بوویت تا ئەمڕۆ کتێبی باش لەلات دەست بکەوێت. هەرکەسێک گوێ لە قسەکانت بگرێت، دەزانێت ئەهلی کتێب نیت. ئەمە تۆی هەی پەنجەشین!"

دایانە قاقای پێکەنین و دەستیان کردە ملی یەکتری. پیاوەی سمێڵزەرد و پەنجەشین چوویە دەرەوە، لەوسەرەوە لەگەڵ خۆی دوو پیاڵە چای هێنا. پیاڵەکان زۆر زەریف بوون، ملێکی بارێک، بە گوڵی سوور و سپی ڕازێنرابوونەوە. "ئەوە پیاڵەکانی بوخاران، قافڵەچییەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیانهێنن، چای ناویان زۆر خۆشە." پەنجەشین بەم جۆرە باسی پیاڵەکانی کرد.

## (٣٤)

**بۆنی کتێبەکانی دەکرد.**

بە بۆن کتێبە باش و خراپەکانی لەیەک جیا دەکردەوە. لەمسەری ڕەفەکانەوە تا ئەوسەری، یەکبەیەک بۆنی کتێبەکانی کرد. هیچ کتێبێکی بەدڵ نەبوو. ڕووی کردە دۆستەکەی و بەخەمباری پێی وت، "داخەکەم، زۆربەی کتێبەکان ژەهر دەڕێژن."

دۆستەکەی، کە ناوی سالمی پەنجەشین بوو، سیگارێکی پێچایەوە و بەدەم پێچانەوەی سیگارەکەوە زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و بەرسڤی دایەوە، "گوێ مەدەرێ. سەردەمێکە هەمووشت ژەهراوی کراوە، خۆ ناکرێت لەم ژەهراوییبوونەدا کتێبەکان تاقانە بمێننەوە، ڕاستیت بووێت، لە بنەڕەتەوە بەشێک لە کتێبەکان بوون مرۆڤیان بەو دەردە برد."

"تۆ ڕاست دەکەی... تۆ ڕاست دەکەی. بەڵام ئەوەی حەقیقەت بێت، کتێب دەبێ وەک باڵندە بێت، باڵی هەبێت، گەر نەشتوانێت لەگەڵ خۆی بەرزت بکاتەوە، دەتوانێت خەیاڵی فڕین بخاتە ناو ژیانتەوە. (پێدەچێت ئەرکە ڕاستەقینەکەی

کتێب کۆتایی هاتبێت.)"

خەمێکی زۆر دای گرت و لە گۆشەیەکدا دانیشت. دوو کەس خۆیان کرد بە دەستنووسخانەکەدا، یەکێکیان یەکسەر دەستی برد لەناو ڕەفەیەکدا کتێبێکی دەر هێنا و ئەمدی و ئەودیوی کرد و بە هاوڕێکەی تەنیشتی خۆی وت، "ئەمەی بۆ دەکڕێت، ئەمە یەکێکە لەو کتێبانەی یەک جار بیخوێنەوە، بۆ هەمیشە خەوت لێ دەکەوێت. تۆ نازانیت کتێب چۆن خەوت لێ دەخات، کتێبێکی ئایینی نییە مرۆڤ فێری خەولێکەوتن نەکات، ئەم کتێبەش یەکێکە لەوانە."

نەیویست تێکەڵی باسەکەیان ببێت، قسەی کڕیارەکە بۆ هاوڕێکەی ڕاست بوو، یەکێک لەو کتێبانەی زۆرترین ژەهری پێوەیە، کتێبە کۆنە ئایینییەکانن. ئەوانە زیندانێکن، هەر خوێنەرێک چوویە ناویانەوە، بۆ هەمیشە لەو زیندانەدا گیرۆدە دەبێت. هێندەش شەرمی لە خۆی دەکرد، لە ڕووی نەدەهات دەری بخات کتێبێکی دەستنووسی پێیە و حەز دەکات بڵاوی بکاتەوە، دەترسا لەوەی ڕووناکیی ناو کتێبەکە هێندە بەهێز بێت، خەڵکی شارەکە بەرگەی نەگرن و دیسانەوە نەفرەتی لێ بکەن. دەمێکیش نائارام بوو، لە دڵی خۆیدا دەیوت، "باڵدار لە چی دەترسیت، تۆ گەر ڕەشەبایەک نەبیت لەو کێوانەوە هاتبیت، ئیتر بۆ هاتوویت."

(ئەو مرۆڤەم خۆش دەوێت، ئیرادەی هێندە بەهێزە، هیچ سەردەمێک ناتوانێت بیشکێنێت.)

## (٣٥)

**بەناو شارەکەدا دەگەڕا.**

یارمەتیی لە سالمی پەنجەشین خواست و هاتە ناو شارەکە.

جارچییەک لەسەر سەکۆیەک هاواری دەکرد، "خەڵکینە، ئەمڕۆ میری گەورە خەوتووە، با هیچ کەسێک بە دەنگی بەرز لەنزیک کۆشکا قسە نەکات و بەخەبەری بهێنێت، هەرکەسێک بەخەبەری بهێنێت، سزای دەدەین."

(ئەوانەی لەسەر کورسیی دەسەڵات دادەنیشن، زۆربەیان گەمژەن.)

خەڵکەکەش سەری ڕەزامەندییان بۆ ڕادەوەشاند. میرزای باڵدار نەیدەزانی کۆشکەکە لەکوێیە، لە یەکێکی پرسی، ئەویش بە دەست ئاماژەی بە لای چەپ دا و بەرەو کۆشکەکە کەوتە ڕێ. کە گەیشتنە لای کۆشکەکە، چرپاندی بە گوێی کەرەکەیدا، "شتێک بکە." ئەویش خۆیئاسا بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە زەڕین. ئەو ناوە شڵەژا، خەڵکەکە خۆیان لێ دوور دەخستەوە. دوو پاسەوان هاتنە دەرەوە و میرزای

باڵدار و کەرەکەیان ڕاکێشایە ژوورەوە. میر بە سەروچاوێکی ترشاوەوە هاتە حەوشەکە و بەبێئەدەبییەوە هاواری کرد بەسەریدا، "ناتوانی ئەو کەرە بێدەنگ بکەیت؟"

"قوربان، کەر هەمیشە هاوار دەکات و بێدەنگی نازانێت."

"ئەستەغفورەڵڵا، یانی مەبەستت منە؟"

"نا قوربان مەبەستم کەرە."

"تۆ خەڵکی کوێیت؟"

" ئەو بنارە."

"ئیشت چییە؟"

"ڕێبوارم."

"بۆچی کەرەکەت منی لە خەو هەڵساند؟"

"ئیشی کەرەکەم ئەوەیە خەوتووەکان لە خەو هەڵسێنێت!"

"بەنەفرەت بیت. دووری بخەنەوە لە بەرچاوم تا شێتی نەکردووم. ئەم شارەش پڕ بووە لە شێت."

قۆڵی خۆی و ڕەشووەی کەرەکەیان گرت و تا بەردەرگای حەوشە ڕایان کێشان. یەکێک لە پاسەوانەکان دڵی پێی سووتا، بەترسەوە وتی، "ماڵت ئاوا بێت، تا شیلاقکاری نەکراویت، دوور کەوە لەم ناوە."

(ترسنۆکەکان هەمیشە لە ئازار دەترسن.)

کەیفی بە خۆی هات، خەوەکەی میری بە زەڕینی کەرێک تێک دا. گەر یەک-دوو جار خەبەریان بکردایەتەوە، ئەویش ئاوا کەرانە هاواری نەدەکرد.

(دانیشتن لەسەر کورسی، گەورەت ناکات.)

# (٣٦)

**بە کۆلانێکی باریکدا تێپەڕی.**

منارەی مزگەوتێک لە ناوەڕاستی کۆلانەکەدا خۆی قیت کردبوویەوە.

لەژێر سێبەری منارەکە دانیشت و کوپەشەرابەکەی دەر هێنا و دەستی کرد بە خواردنەوەی شەراب. هێشتا دوو قوم شەرابی خواردبوویەوە، مەلای مزگەوتەکە لە بازاڕ گەڕایەوە، بینیی کەسێک لەژێر سێبەری منارەکە مەی دەنۆشێت، چاوی چووە پشت سەری، هەر لە دوورەوە دەستی کرد بە هەڕەشەکردن و جنێودان. "هەی بێئابڕوو... هەی لەخوانەترس... هەی دوژمنی خوا... هەڵسە، هەڵسە لێرە، تا ئەم ناوەشت پیس نەکردووە! تۆ شەرم ناکەیت بەم سەر و تەمەنەتەوە مەی دەنۆشی؟"

خۆی تێک نەدا، دەستی برد گۆزەشەرابەکەی بەرز کردەوە و پڕ بە دڵی خۆی یەک قومی تری لێ دا و قوڵپینەیەکی بۆ کرد و هەڵسایە سەر پێ، دەستی خستە سەر سنگی مەلاکە و بە شێوازی خۆی جوابی دایەوە،

"من ئەم شارەم پیس کردووە یان تۆ. ئەم منارەیەی پشتی سەرم دەبینی، ئا ئەم منارەیە ڕۆژانە ئیشی ژەهراویکردنی ژیانی خەڵکە. تۆ بۆچی تۆزێک دەمت پاک ناکەیتەوە، هەست ناکەیت دەمت زۆر پیسە!"

مەلاکە نێوچاوانی دا بەیەکدا و پاڵێکی پێوە نا، "بڕۆ ئەولاوە، بۆنی دەمت ڕۆژەڕیێیەک دەڕوات."

"جا بۆنی شەراب پیسە، یان بۆنی ئەو ژەهرەی لە دەمی تۆوە دێتە دەر. خۆ من خەریکە دەخنکێم کە دەمت دەکەیتەوە، ئەزانی بۆنی وشەکانی ناو دەمت چەند پیسە."

"یا حەولە وەلا... ئەمە چ ئەهریمەنێکە بەرۆکمان بەر نادات."

"من ئەهریمەن نیم، لە تۆش زۆر باشتر خودا ئەناسم. ئەشزانم خودا لە هەموو شوێنێک بێت، لەناو ئەو دڵە پیسەی تۆدا نییە. هاتووم تا پێت بڵێم، ئیتر ژیانی خەڵک ژەهراوی مەکەن. با باش بزانیت مەستیش نیم، تەنها ویستم تێت بگەیەنم لەژێر سێبەری ئەم منارەیە بۆیە شەرابم خواردەوە، تا ڕۆحم لەو ژەهرە بپارێزم کە لەو منارەیەوە بڵاو دەکرێتەوە."

مەلا ڕەنگی سوور و شین بوویەوە، نەیدەزانی چی بکات. نە لە ڕووی دەهات پیایدا بکێشێت، نە پێشی دەکرا جوابی بداتەوە. میرزای باڵداریش ڕەوتی خۆی تێک نەدەدا، تا دەهات، دەنگیشی بەرزتر دەکردەوە بەسەریدا. بەگاڵتەپێکردنێکەوە چاکی مەلاکەی گرت، "چییە خۆت لەژێر ئەم چاکەدا شاردووەتەوە، وا دەزانی بە چاکێکی لەم جۆرە ئیتر ژەهرەکەی ناخت دەبێتە دەرمان. دە بڕۆ هەی

ژەهـراوی..."

مـەلا زۆر لەسـەری نەڕۆیشـت و خـۆی کـردەوە بەنـاو مزگەوتەکـەدا. ئەمیـش شـەرابەکەی پێچایـەوە و بـە هەمـان کۆڵانـدا بـەرەو خـوار بوویـەوە.

(خەنجەرەکەت دەر بێنە، بیدە لـەو شـوێنەی مـرۆڤ بەئاگا دێنێتـەوە.)

# (٢٧)

**هەورێک هات.**

لە چاوترووکانێکدا بارانێکی بەخوڕ دای کرد.

میرزا و کەرەکەی خۆیان دایە ژێر پاسارێک. بارانەکە بارانی بەهاران بوو، هێندە بەخوڕ بوو، لە چاوترووکانێکدا تەپوتۆزی ناو کۆڵانەکانی شێلا و کردنی بە قوڕاوێکی خەست و جۆگەئاوی قوڕاوی بەرز بوویەوە.

(هیچ بارانێک ئەم شارە پاک ناکاتەوە.)

لەبەر ئەوەی قوڕاوی نەبێت، کەواکەی هەڵکرد و پانتۆڵەکەشی تا نزیکەی ئەژنۆکانی هەڵکێشا. مێزەرەکەشی لەسەر سەری داگرت و خستیە ژێر باڵی.

سەیری دیمەنی بارانبارینەکەی دەکرد. تنۆکەبارانەکان بەشوێن یەکدا، بەخێرایی لە سەرەوە دەهاتن و دەکەوتنە سەر زەوی و لەگەڵ کەوتنیان بۆ سەر زەوی، بەرز دەبوونەوە و دەنگێکیان لێوە دەهات. لەوسەری کۆڵانەکە لە خۆشیی باران و قوڕاو، کۆمەڵێک منداڵ هاتبوونە دەرەوە، لەناو قوڕ و چلپاوەکەدا کردبوویان بە ڕۆژی خۆیان.

(منداڵان هەمیشە بەشوێن شتە جوانەکاندا دەگەڕێن.)

سەوزەفرۆشێک عەرەبانەکەی سیخناخ کردبوو لە سەوزە. لە خۆشیی بارانەکە و تەڕکردن و شوشتنەوەی سەوزەکان، لەژێر بارانەکەدا بە دڵێکی خۆشەوە پاڵی بە عەرەبانەکەوە دەنا و هەر لەخۆیەوە پێدەکەنی. (باران خەمگینی دەسڕێتەوە.)

کابرای عەرەبانچی گەیشتە لای میرزا و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وت، "حەیف... حەیف.. بۆ تۆ، خۆت لەم جوانییە لا دەدەیت!"

میرزا بە خۆیدا چوویەوە. ڕاستی دەکرد. خۆلادان لە باران، خۆلادانە لە جوانی. قسەی عەرەبانچییەکە لەگەڵ تنۆکەکاندا بەر بوویەوە سەر زەوی و بوو بە جۆگەیەک ئاو بەناو کۆڵانەکەدا بەرەو خوار ڕۆیشت. عەرەبانچییەکە تۆزێک دوور کەوتەوە، میرزا هەنگاوێک لەژێر پاسارەکە هاتە پێشەوە، دوو تنۆک باران بەر لووتی کەوت و زەردەخەنەیەکیان خستە سەر ڕوخساری. مێزەرەکەی لە بن باڵی دەر هێنا و خۆی دایە بەر بارانەکە.

(گەر باران پاکمان نەکاتەوە، هیچ ئایینێک پاکمان ناکاتەوە.)

تا چێژ لە بارانەکە ببینێت، ماوەیەک بەبێ جووڵە وەستا. تنۆکەکان نەرم نەرم شان و مل و سەرلووتیان تەڕ دەکرد، هێندە بەشوێن یەکتریدا هاتنە خوارەوە، لەسەر لووتیەوە دڵۆپەئاو قەتارەی بەست و بەر بوونەوە سەر ڕیشی و تەڕیان کرد. ئینجا کە تەڕ بوو، ڕەشووەی کەرەکەی گرت و بە کۆڵانە قوڕاوییەکەدا شڵپەشڵپ بۆ گۆشەی لای دەستەڕاست ڕۆیشتن.

## (٣٨)

**زەنگی کەنیسەکە**

لەگەڵ لێدانی زەنگی کەنیسەکەدا، خۆی و کەرەکەی ڕاچڵەکین.

(وای خودایا، هەموو شوێنێکی ئەم شارە تەنراوە بە ژەهر.)

کەرەکەی کەوتە پێشی و جڵەوەکەی بۆ شۆڕ کرد. شوێن کەرەکەی کەوت و خۆی کرد بەناو کەنیسەکەدا. کە قەشە لەوسەرەوە بینیی پیاوێک و کەرێک وەژوور کەوتن، بەهەڵەداوان هاتە بەردەمیان و دەستەکانی کردەوە، "بۆ کوێ؟"

"دەچینە ناو کەنیسەکە."

"ئەم کەنیسەیە پیرۆزە نابێت، کەرێک بچێتە ناویەوە."

"ئەم کەرە چ جاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئەو کەرانەی هاتوچۆی شوێنە پیرۆزەکان دەکەن؟"

"زمانت بگرە پیرەپیاو. ئێرە شوێنی خوداپەرستییە، دەتەوێت بەم کەرەوە بێیتە ژوورەوە و بێحورمەتی بکەیت؟"

"نا قەشەی بەڕێز، من نەهاتووم کەرەکەم بهێنم، کەرەکەم هاتووە و منی هێناوە. شوێنی من ئەم ژەهرخانانە نییە، کەر بۆچی بۆ ئەم شوێنانە نابێت؟ بۆ مەگەر پەیامبەرەکەت کەرێکی لەگەڵ نەبوو؟"

"با لەگەڵی بوو."

"باشە پەیامبەرەکەت پیرۆزە یان شوێنەکە؟"

"بێگومان پەیامبەرەکەم."

"کە وایە، ئەو بۆچی بە کەرێکەوە بۆ هەموو شوێنێک دەچوو؟ کەچی نابێت کەر بێتە ناو شوێنە پیرۆزەکانەوە؟"

قەشە دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو. نەشیدەتوانی ڕێگەی بدات بچێتە ژورەوە. وەڵامێکی قایلکەریشی لا نەبوو، سوور هەڵگەڕابوو. میرزا زەردەخەنەیەکی تێگرت و جڵەوی کەرەکەی گرت و بە دەنگی بەرز، بۆ ئەوەی قەشە گوێی لێ بێت، بە کەرەکەی وت، "ئێرە شوێنی تۆ نییە، کەر ئەوەندە زۆرە، هەرگیز ڕێگا نادەن شوێنی تۆ هەبێت."

قەشە قسەکەی زۆر پێ ناخۆش بوو، لە مەترسیی جوابی خراپتر، بێدەنگیی هەڵبژارد. میرزا و کەرەکەی لە دەرگاکەی حەوشەکە بەدەر کەوتن و ون بوون.

(هەتا شوێنە ئایینییەکان زۆر بن، عەقڵ کەمە.)

## (٢٩)

**تەقەتەقێک دەهات.**

تا زیاتر نزیک دەبوونەوە، دەنگی تەقەکە زیاتر دەکەوتە بەر گوێ.

دوو ئەسپ لە بەردەرگاکە وەستابوون، سمکۆڵانیان بوو. سەریان خستبووە ناو توورەکە هەڵواسراوەکەی ملیان و دەلەوەڕان. دەنگی تەقەکان لە ژوورەوە دەهات. میرزا سەرێکی لار کردەوە بۆ ژوورەوە، بینیی ناڵکەرێک خەریکی ناڵکردنی ئەسپێکە. یەکسەرە دەستی برد بۆ توورەکەکەی بەر کەمەری. لەناو توورەکەکەدا چەند درهەمێکی دەر هێنا و خستنیە سەر لەپی دەستی. دەستی درێژ کرد بۆ ناڵکەرەوە و پێی وت، "ئەم درهەمانە بەشی ناڵی ئەم کەرەم دەکەن." ناڵکەرەکەش یەکێکیانی هەڵگرت، هەر ئەمە بەسە.

میرزا دەستێکی خستە سەر ملی کەرەکەی و وەک بڵێی قسە بۆ مرۆڤێکی زۆر ئازیز دەکات، پێی وت، "ئاخر هاوسەفەر، تۆ بۆچی خۆت دەکەیت بە شوێنانێکدا شوێنی تۆ نییە، ئەمە شوێنی تۆیە. ئەمڕۆ جووتێک ناڵی باش و

دەنگخۆش دەخەمە ژێر سمەکانت. بە کەیفی خۆت غار بدە و هەڵبەزودابەز بکە.

لە بەردەرگاکە وەستان تا ئەسپەکان تەواو بوون. وەستاکە چوار ناڵی تازەی دەر هێنا و کەرەکەیان ڕاکێشایە ژوورەوە. کەرە بەبێ هیچ لاساریکردنێک قاچێکی بەرز کردەوە و میرزا قاچی کەرەکەی خستە سەر ئەژنۆی و ناڵکەرەکەش تۆزێک سمەکانی بۆ تاشی و ناڵەکانی خستە سەر سمەکانی و بە بزمار کوتینی. ساتی ناڵکردنەکەی دوو-سێ جار خەریک بوو بزمارەکان خوار بکەن و بیپێکێت.

لەناو هۆدەی ناڵکردنەکەدا، کوورەیەک هەبوو، کوورەکە سوور سوور بووبوویەوە. گەرمای کوورەکە ژوورەکەی هالاوی کردبوو، وەستای ناڵکەرەکەش هەموو گیانی لە ئارەقەدا خوسابوو.

(گەرمی ناخی مرۆڤ، لە گەرمی کوورەیەک دەچێت، ڕەقییەکان دەتوێنێتەوە.)

بەبێ لاساریی کەرەکە، ناڵکردنەکەیان تەواو کرد. دوای ناڵەکان، کەرە وەک شتێکی غەریبی بەسەر هاتبێت، دوو-سێ جووڵەی بە دەست و پێیەکانی کرد. لەتەک هەر جووڵەیەکدا، دەنگی ناڵەکان بەرز دەبوویەوە.

میرزا ئاسوودە بوو، کێشەی ناڵی کەرە بۆری نەما. لە ڕێگادا کە دەهاتن، لە ترسی بێناڵی بە شوێنێکدا دەڕۆیشت، بەردەڵانی تێدا نەبێت. ئێستا ئیتر خەمی بەردەڵانی نەما، دەتوانێت بە داروديواردا بڕوات.

(هاوسەفەرەکەت هەرچی بێت، بەشێکە لە ژیانت.)

## (٣٠)

**ڕەوتی ڕۆیشتنی کەرە گوڕا.**

ملی خۆی بەرز کردبوویەوە و بەئەسپایی قاچەکانی خۆی دادەنا.

لەگەل هەر قاچدانانێک، دەنگی خوڕپەیەک بەرز دەبوویەوە و قاچە بۆرەکانی دەچەقین بەناو قوڕاوەکەدا. وا ڕەوتی ڕۆیشتنی گۆڕابوو، لە ئەسپێک دەچوو لە مەیدانێکی ئەسپسواریدا. زووزوو سەرێکی با دەدا و پرمەیەکی بۆ دەکرد و کلکی خۆی دەکێشا بە کورتانەکەدا، شلپەی دەهات.

میرزا دەیزانی کەرە شانازی بە خۆیەوە دەکات و دەیەوێت ڕەوتی ڕۆیشتنی خۆی دەر بخات.

بارانەکە خۆشی کردەوە. چاوە گەورە و ڕەش و تەڕەکانی، وەک مزراحێک دەسووڕانەوە و سەیری ئەملا و ئەولایان دەکرد. تووکە بۆرەکانی سەر ملی درێژ بووبوون. کە با دەهات، لەمدیوەوە دەیخستن بەودیودا. ڕەنگە بۆرەکەی بە هۆی چاخییەوە، هێندەی تر بۆر بووبوو. لەخوار ڕانەکانیەوە پەلەیەکی سپی تا سەر سمەکانی ڕۆیشتبوو.

کورتانێکی سووری کاڵی بەسەرەوە، قەپۆزێکی مەیلەو ڕەش، تووکی سەرئەژنۆکانی وەریبوون و سپییان دەکردەوە. دوو گوێی قوت، تووکە ناسک و نەرمەکانی گوێیەکانی بارانەکە نووساندبوونی بەیەکەوە و جۆگەلەیان بەستبوو.

میرزا بە گۆڕینی ڕەوتی ڕۆیشتنی کەرەکەی پێکەنینی نەدەهات. دەیزانی گیانەوەرەکانیش بەشێک لە جوانییەکانی خۆیان دەبینن و شانازیی پێوە دەکەن، بەتایبەتی چوارپێکان. ئەسپ یەکێکە لەو گیانەوەرانەی کە خۆی دەزانێت جوانە. بیەوێت جوانییەکەی خۆی پیشانت بدات، زۆر بەنازەوە پیشانت دەدات و بەبێ ئەوەی زمانی بەکار بهێنێت، پێت دەڵێت، "من جوانم."

کەرە بۆر هەستی بە جوانییەکەی خۆی کردبوو.

بەلای دەستەچەپدا سوورڕانەوە، لەوسەری کۆڵانەکەوە ڕێڕەوێک دیار بوو، ڕێبواران هاتوچۆیان پێدا دەکرد. گەیشتنە سەر سووچی ڕێڕەوەکە، لەوسەرەوە دوو ئەسپسوار پێش قافڵەیەک کەوتبوون. خەڵکەکە خۆیان لا دا و دوای ئەسپسوارەکان قافڵەیەک هات. لە ناوەڕاستی قافڵەکەدا ئەو میرەی کەرەکە لە خەو هەڵی ساند، لەناو عەرەبانەیەکی ئەسپدا پاڵی دابوویەوە. پێش و دوای ئەسپسوار بوون.

(حەیف نییە بەو چوارپێیە دەڵێن کەر و بەوانەی سەر کورسیی فەرمانڕەوا دەڵێن مرۆڤ.)

گەیشتە ئاستی ئەمان، میر بەمۆنی چاوێکی تێ برین. میرزا زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و کەرەش وەک بڵێیت دەیناسێتەوە، هەتا هێزی تیا بوو زەڕاندی.

# (٣١)

**شارەکە تەواو پیس بووبوو.**

خەڵکی ناو شارەکە بەو شتانەوە سەرقاڵ بوون، کە شتی کاتی بوون.

میرزای باڵدار هەستی بەوە کرد دەبێت ئەم شارە دەسکاری بکرێت، یانی هیچ نەبێت دەسکاریی زمان و خەیاڵی خەڵکەکەی بکرێت. ئەوانەی بیر لە دەسکاریکردنی شارەکان دەکەنەوە، وا دەزانن دەبێت دەست بۆ شەقام و کۆڵان و بازاڕەکان ببەن، بێئاگا لەوەی ئەو شوێنانە مرۆڤەکان ناگۆڕێت، ئەوە مرۆڤەکانن شوێنەکان دەگۆڕن. دەسکاریکردنی زمان و خەیاڵی مرۆڤەکان، دەسکاریکردنی دونیایە.

بیری لەوە دەکردەوە لەکوێوە دەست پێ بکات، کاتی خۆی تەنگەتاویان کرد و دوور کەوتەوە لێیان، دەستی بۆ خەونەکانیان بردبوو، ئەم جار پێویستە دەست بۆ دوو شتی تر ببات، لەوەی پێشوو قورستر و زحمەتترە. (هەموو سەردەمێک، پێویستی بە زمانێکی تازە هەیە.)

دەستخستنەناو خەیاڵ و زمانیان، وێران و شێتیان نەکات باشە. ئەوان ڕازی نەدەبوون کەس دەست لە خەونەکانیان بدات، ئەبێت بۆ زمان و خەیاڵیان چەند ئازار بکێشن، بگۆڕێن بۆ سەردەمێکی نوێ. (هەموو سەردەمێکی نوێ، پێویستی بە خەیاڵی نوێ هەیە.)

لەسەر سووچی ڕێڕەوەکە، دۆش دامابوو. سەیری خەلکەکەی دەکرد قسە دەکەن. سەیری دوکاندار و کڕیارەکان، سەیری ڕێبوارەکان و دەستگێڕەکان. هەر هەموویان خەیاڵ و زمانیان هێندە کۆن بوو، لیکترازانێکی خستبوویە نێوانیانەوە. ئەوان نەیاندەزانی ئەوە سەردەمەکە نییە تا دێت لە یەکتریان دوور دەخاتەوە، ئەوە زمان و خەیاڵیانە ئەم درزەی دروست کردووە. لەم دەرککردنەدا، بەپەشۆکاوییەوە دەستی برد بۆ توێشەبەرەکەی، بە دەستەکانی تێشووەکەی گوشی، گومانی ونبوونی دەستنووسەکەی دای لە بیرکردنەوەی. باش بوو دەستنووسەکە لەناو تێشووەکەدا مابوویەوە. ئاهێک هاتەوە بەبەریدا و لەبەر خۆیەوە وتی، "دەرمانی دەردی ئێوە لای منە."

لەو کاتەوەی هاتبوویە ناو شارەکە، تەنها شتێک زۆر لێی ورد دەبوویەوە و سەرنجی دەدا، شێوازی قسەکردنی خەلکەکەی بوو. ئەم خۆی لە گۆشەگیرییەکەیدا گەیشتبوویە بەرزاییەک، لەو بەرزاییەدا زمانی نوێ، خەیاڵی نوێ دەیتوانی بیگەێنێت بە پەیبردن بە خەونەکان. دەشیویست هەمان دۆخ بەسەر خەلکی ئەم شارەدا ئەزموون بکات، بێخەبەر لەوەی دونیاکەی ئەو، ئاسۆکەی بەردەمی ئەو، لەتەک ئەم خەلکەدا ئەرز و ئاسمانی جیاوازە. ئاسان نییە

بتەوێت دەست بخەیتە ناو خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەو هەموو خەڵکەوە. لەوەش قورستر نەریتپارێزەکانن، کە دەبنە دوژمنی هەموو دەنگێک و دونیایەکی نوێ. خۆیشی دانابوو ڕووبەڕووی چی دەبێتەوە، ئەما بڕوایەک بوو لەم بڕوایەدا وێرانیشیان بکردایە، وێرانییەکەی پێ باشتر بوو، تا خۆگونجانێک لەگەڵ سەردەمە وەستاوەکەدا.

## (٣٢)

**لەناو دەستنووسەکاندا دانیشت.**

یەکێک لەو کتێبە چاککراوانەی لە گۆشەی سەرەوەی کتێبەکاندا دەر هێنا.

کتێبێکی شیعری بوو، هی یەکێک لە شاعیرەکانی ئەم شارە. بە سەبکێکی کۆنەوە، بە زمانێکی چڕی ئاڵۆزە نووسرابوو. پێدەچوو شاعیرەکەی، گەرچی دەردەدڵی زۆر لە شیعرەکانیدا خۆیان دەر خستبوو، ئەما ویستبووی بە زمانێکی ئاڵۆزی فرەمانا بینووسێت، بۆ ئەوەی هەمووکەس لێی تێنەگات. شاعیرانی ئەو سەردەمە، هەریەکەیان دوو-سێ زمانی بێگانەی دەزانی. لەناو شیعرەکانیاندا باڵادەستیی زمانی خۆیان دەر دەبڕی. ئەوەندەی بەلایانەوە گرنگ بوو لە ڕێگەی باڵادەستیی زمانەوە وێنەی جوانی ژیان و مرۆڤ بنەخشێنن، ئەوەندە بەلایانەوە گرنگ نەبوو باسی ئەو شتانە بکەن، کە دەبێت شیعر باسیان بکات.

هەندێکیشیان شارەزا بوون لە جوانکردنی دەردەکانی خۆیان و کردنیان بە شیعر. بەسەرنجەوە بەیت دوای بەیت

شیعرەکانی دەخوێندەوە. لە بەیتێکدا ڕوخساری دەدا بەیەکدا و لەبەر خۆیەوە دەیگوت، (ئەمە زنجیرکردنی مرۆڤە، یان شیعر؟)

لە بەیتێکی تردا زەردەخەنەیەکی بۆ دەکرد و دووبارە دەیگوت، ( بەنەفرەت بێت ئەوەی پێی وایە شیعر هەست و نەستە.)

بەم جۆرە پەڕە دوای پەڕە هەڵی دەدایەوە و لە هەرشوێنێکدا دەوەستا، تانەیەکی پێدا دەکێشا. شتێک زۆر ئازاری دەدا، لاوازیی زمانی شیعرەکان و خەیاڵی شیعرەکان بوو. ئەوەی لە گۆشەگیریدا بوویە چەقی بیرکردنەوەی و کردی بە خەمی خۆی، ئێستا لەناو کتێبەکاندا بەدی دەکرێت و وزەیەکیان دایەوە بەری. واتە هاتنەکەی بۆ ناو شارەکە، هاتنێکی بێسوود نەبووە. (بەڕاستی ئەم شارە پێویستی بە بیرکەرەوەیەک هەیە تا لەو هەموو ژەهرە ڕزگای بکات.)

سالمی پەنجەشین لەوێ نەبوو. کە هاتەوە، بەپێکەنینەوە سەیرێکی کرد. میرزای باڵدار وا بەقووڵی چووبوویە ناو شیعرەکانەوە، باش ئاگای لێ نەبوو. ئەویش خۆی تێک نەدا و ڕۆیشتە دەرەوە و بە دوو چایەوە گەڕایەوە. یەواشێک چایەکانی لە بەردەمیدا دانا و لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت.

میرزا سوپاسێکی کرد و بە ڕوویەکی گەشەوە، کە ئەوە یەکەم جاری بوو ئاوا ڕووی گەشی لێ ببینرێت، پرسیی، "ئەمە کێییە؟"

"ئەوە یەکێکە لە شاعیرە بەناوبانگەکانی ئەم شارە!"

"بەهـ.. بەهـ.. ئەمە بەناوبانگەکەیان و باشەکەیان بێت،

دەبێت خراپەکەیان چۆنچۆنی بێت."

"بۆچی وا دەڵێیت، شیعرەکانی زۆر ناسک و جوانن!"

"شیعر بە ناسکی و جوانی نابێت بە شیعر."

"ئەی بە چی دەبێت؟"

"بە خەیاڵی نوێ، بە زمانی نوێ، بە یاخیبوون دەبێت بە شیعر."

"شتەکەم لێ قورس مەکە."

"نا، قورسی ناکەم، بەس تێناگەیت چی دەڵێم."

"تێدەگەم، بەس لە ئێستادا تێناگەم!"

"باشتر، هەر تێمەگە. ڕۆژێک دێت تێدەگەیت چ زەنگێکم لێداوە."

## (٣٣)

**دۆستی ئازیز دەبێت قسە بکەین!**

ئەمەی بە سالمی پەنجەشین وت و کتێبە شیعرییەکەی خستەوە سەر ڕەفەکەی سەرەوە. ئەو کۆتەرەیەی لە ژێریدا بوو، ڕای کێشایە ئەملاوە و لەتەنیشتیەوە دانیشت. دەسەتێکی هێنا بە ڕیشیدا و لووتی خۆی خوراند. مێزەرەکەی لەسەر سەری داگرت و لەبان یەکێک لە کتێبەکان دای نا. ڕووی تێ کرد و بە شێوەیەکی ڕژد دەستی کرد بە قسەکردن.

"من هەست بە شتێک دەکەم، هەست دەکەم تەنها هەست نییە، بە بیرکردنەوە گەیشتووم بەمە. ئێمە هاوڕێ و دۆستین، تۆ ئەتوانیت یارمەتیم بدەیت، تۆ نیوەی کارەکە دەکەیت و نیوەکەی تریشی کە لەسەر شانی منە، تەواوی دەکەم!"

"خەریکە دەمترسێنیت!"

"نا... ناتترسێنم. ترسی تیا نییە، کاسپییەکی باشە بۆ تۆ. هەرچی ڕووبەڕووی کارەکەت بکرێتەوە، یەخەی تۆ ناگرن، یەخەی من دەگرن. شەڕێک هەڵدەگیرسێنم، لەم شەڕەدا یا بەتەواوەتی دەربەدەر دەبم، یان هەموو ئەوەی تۆ دەیبینی

لەم هۆدەیەدا، کەلکی فرووشیکی نامێنێت."

"جا براکەم بۆ ماڵی خۆم کاول بکەم، لە دارای دونیا هەمە و نیمە ئەم کتێبانەیە، کە بە ڕەنجی شانی خۆم چاکم کردوون، بۆ کارێک بکەم کەلکیان نەمێنێت و بکەوم."

یەک قاقای لێدا. وای، چەند ساڵێک بوو ئاوا پێنەکەنیبوو. قاقاکەی لە دڵەوە بۆ هات. دەنگی قاقای پێکەنینەکەی بەناو هۆدەکەدا بڵاو بوویەوە و خۆی کرد بەناو کتێبە کۆنەکاندا. کەرەکەی، کە لە بەردەم دوکانەکەدا وەستابوو، بە دەنگی قاقاکە جووڵا و سەرێکی کرد بەناو دوکانەکەدا. دوو ڕێبواریش تێدەپەڕین، بە دەنگی قاقاکە وەستان و زەردەخەنەیەکیان بۆ کرد.

دەستی خستە سەر شانی سالمی پەنجەشین و بەدڵنیابوونێکەوە دڵنیای کردەوە، کە ئەوەی ئەم دەیکات، پارەی زۆر زیاتری تێدایە لەم هەموو کتێبەی دای ناون.

سالمی پەنجەشین نەدەچوویە مێشکیەوە. دەیهێنا و دەیبرد، بیری لە ژیانی خۆی و خێزانەکەی دەکردەوە، گەر بکەوتایە و ئەمەشی لەدەست بچووایە، ئیتر ماڵی کاول دەبوو.

میرزای باڵدار، کەیفی بوو. دەستە بارێک و زبرەکانی دەهێنا بەسەر ئەژنۆکانیدا و بەغرووریکەوە سەری بەرز دەکردەوە و سەیری ڕیزەکتێبەکانی دەکرد و دەیگوت، "وەی بە حاڵی ئێوە، ڕەشەبایەک دێت، پەڕ و باڵتان دەکات."

سالمی پەنجەشین هێندەی تر ترس نیشتە گیانیەوە. خۆی نەگرت و بەترسێکەوە وەڵامی دایەوە، "برام، تۆ بەنیازی چیت، ناشێت بەم ئاخری تەمەنەتەوە هاتبیت ماڵی من وێران بکەیت. خۆ کوفرمان نەکرد دۆست بووین. لەم

شـاره گەورەیـە بۆ پێچاوتـە بـە کتێبەکانـی منـەوە، بـۆ ناچـی شـتێک بکەیـت، لانـی کـەم زەرەری منـی تیـا نەبێـت."
(وەستان لە شوێنی خۆتدا، مەرگە.)

## (٣٤)

**لە دەرەوە بوو بە دەنگەدەنگ.**

لە سووچێکی دەرگاکەوە سەیری کرد، خەڵکێکی زۆر کۆ بوونەتەوە.

لەناو خەڵکەکەدا یەکێک چووەتە سەر کۆتەرەیەک و بە دەنگی بەرز قسە دەکات و دەستی ڕادەوەشێنێت. هەڵسا چوویە بەردەم دوکانەکە، تەماشای کرد یەکێک لە شاعیرەکانی شارەکەیە، سەروڕیشێکی چڵکنی هەیە. کراسێکی بۆری یەخەگەورەی لەبەردایە، کتێبێکی کۆنیشی ناوەتە بندەستی و دەستە درێژ و گەورەکەی تری ڕادەوەشێنێت و هەتا هێزی تیایە بە دەنگی بەرز شیعر دەخوێنێتەوە.

خەڵکەکە لە چواردەوری کۆ بوونەتەوە و هەرکاتێک شاعیرەکە دەوەستێت هەناسەیەک بدات، ئەمان پێکرا چەپڵەیەکی بۆ لێدەدەن. دیمەنەکە زۆر سەرنجڕاکێش بوو. دۆستەکەی هاتە تەنیشتیەوە و پێی وت، "ئەوە سەکۆی شاعیرەکانی ئەم شارەیە، هەرکاتێک یەکێکیان شیعرێکی نوێ دەنووسێت، دێت ئا لێرەدا دەیخوێنێتەوە. ئەگەر

خەڵک پێی خۆش بێت، داوا دەکەن شیعرەکەیان بۆ بخرێتە سەر دەستنووسێک. شاعیرەکە دێتە لای من و بەجوانی بۆی دەخەمە سەر دەستنووسێک و بە نرخێکی هەرزان دەیفرۆشێت بەو کڕیارانەی داوایان لێ کردووە. شیعرەکەشی خراپ بێت، کەس نایکڕێت و دوای خوێندنەوەی، بڵاوەی لێ دەکرێت. چۆنە بەلاتەوە؟"

"زۆر پێکەنیناوییە. یانی ئەمە بازاڕی شیعرە. شیعر شتێک نییە بازاڕی بۆ پەیدا بکرێت. ئەوە ئەو شاعیرە پڕوپووچانەی شیعریان وا نزم کردووەتەوە، کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکەن."

"ماڵت ئاوا بێت، تۆش بە هیچ ڕازی نیت. داماوە بەو دوو قرانە دەژێت، ئی نەیفرۆشێت چی بکات؟"

"بچێت ئیش بکات. خۆ شاعیربوون ئیش نییە، پیشە نییە. شاعیربوون بیرکردنەوە و دونیابینییە. ئەمانە بێحورمەتی بە شیعریش دەکەن. بەنەفرەت بێت. تۆ سەیری بکە چۆن خۆی سوور و مۆر کردووەتەوە، بۆ ئەوەی سەرنجی دوو کڕیار بۆ خۆی ڕاکێشێت، لەو سەوزەفرۆشە دەچێت، کە هاوار دەکات سەوزەکەی لێ بکڕن. ئەمانە شاعیر نین، ئێستا لێی بپرسە شیعر چییە، نازانێت و قسەی قۆڕ دەکات."

"ئیشی من ئەمەیە بازاڕی ئەمانە بکوژم. ئیشی من ئەوەیە شیعر بگەڕێنمەوە شوێنە ڕاستەقینەکەی و لەدەست ئەم چەرچییانە ڕزگاری بکەم."

"بە خوا باڵداری ئازیز، لە تۆ تێناگەم. نازانم چ ئاژاوەیەک لە سەرتایە. خۆت بۆ وا تێک داوە، لێگەڕێ چۆن هاتووە هەر وا بێت و بچێت. چیت داوە لەم سەرئێشەیە."

بە مۆنییەکەوە سەیرێکی کرد و جوابی نەدایەوە.

شاعیرەکە شیعرەکەی تەواو بوو. خەڵکەکە چەپڵەیەکیان بۆ لێدا و بڵاوەیان لێ کرد. دیار بوو کڕیاری شیعرەکەی نەبوون. چۆن هاتبوو، ئاوا ڕۆیشت. کتێبە کۆنەکەی بنباڵی، چۆن ڕەنگی زەرد بوو، شاعیرەکەش ئاوا.
(ئەمانە نەک شیعرەکانیان، خۆشیان ژەهراوین.)

# (٣٥)

**نیگەران بوو.**

بەنیگەرانییەوە لە شوێنەکەی خۆی دانیشت.

"بازاڕ هەموو شتێکی کوشتووە. سەیرکە ئەو خەڵکەی چی لێ کردووە، سەیرکە شاعیران و بنووسەکان و میرزاکان و مێژوونووسانی چی لێ کرد. کەسیانی نەهێشت و کردنی بە کالایەک و لەناو گوڕەپانەکانی خۆیدا هەڕاجی کردن. بازار ئافاتێکە، ڕووی کردە هەر مەملەکەتێک، لەگەڵ خۆیدا تەنانەت خوداکانیش دەکات بە کالا و دەیانفرۆشێت."

ڕووی کردە سالمی پەنجەشین و بەتانەلێدانەوە وتی، "لەم شارەدا کەی خوداکانیش دەفرۆشرێن؟"

"ئەستەغفرەڵلا پیاوی پیر، ئەوە تۆ چی دەڵێیت!"

"بۆچی ئەستەغفرەڵلا، ئەوە نییە لە بەرچاوی من و تۆوە ئێستا پیاوێک هات، خەیاڵ و بیرکردنەوە و خۆیان وتەنی، هەست و نەستی خۆی هەڕاج کرد؟ ئێ مرۆڤ بتوانی شتە تایبەتییەکانی خۆی هەڕاج بکات، دەشتوانێت خوداکەی هەڕاج بکات."

"ئەوە جیایە و ئەمە جیایە!"

"نا دۆستی ئازیزم، جیا نییە. خەڵکی ئەم شارە دەبێت دەرمان بکرێن. یەکەم جار تۆم بینی، پێم وتی ژەهراوی بوویت، نیگەران بوویت. پێم وتی چی دەکەی لێرەدا و بۆ وات لێ هاتووە، تێنەگەیشتی. باش سەیری شتەکان بکە. کەمێک پێش ئێستا وتت ئەوە بازاڕی شیعرە. کە وایە شیعریش بووە بە کەلوپەل و دەفرۆشرێت."

(شتانێک هەن هیی ناخی مرۆڤن، ئەو شتانە بۆ فرۆشتن نین.)

"وایە، ئەوە بازاڕی شیعرە."

"بەڵێ، بە چاوی خۆم بینیم. لێرە نەبوومایە و نەمدیبایە، بڕوام نەدەکرد. وای خودایە، ئەم خەڵکە بۆ ژیان وای لێ کردن تەنانەت جوانییەکانی ناخی خۆشیان بفرۆشن ئەمە ژەهراوی بوون نەبێت، چییە؟ دە تۆ بڵێ، چییە؟"

"دیسانەوە دەستت پێ کردوە. ئەها کوڕە، هێشتا نەگۆڕاویت. هێشتا گەنجە سەرکێشەکەی جارانیت. تۆ بەکەڵکی ئەم شارە نایەیت."

"ڕاست دەکەیت... زۆر ڕاست دەکەیت. من بەکەڵکی ئەم شارە نایەم. ئەم شارە شوێنی ئەوانەیە کە بێباکن، گوێ نادەنێ، بیر ناکەنەوە و گرنگ ئەوەیە قووتێکیان دەست بکەوێت، ئەو قووتە بە خراپترین ڕێگاش بێت، ڕێگاکەیان لا مەبەست نییە، قووتەکەیان لا مەبەستە. خەیاڵ و زمان و بیرکردنەوەیان پیس بووە. من هاتووم پاکی بکەمەوە، بەڵێ، هاتووم پاکی بکەمەوە."

"چۆنچۆنی پاکی دەکەیتەوە؟"

"زۆر بەهێمنی، لە ڕێگەی وشەوە. وشە دەتوانێت پیسترین شوێنی مرۆڤ پاک بکاتەوە. وشە دەتوانێت دونیاش پاک بکاتەوە. من ناڵێم دونیا، بەڵام بە وشە شوێنێکی کۆن تازە دەکەمەوە، کە شوێنە کۆنەکەم تازە کردەوە، دەرگای پاکبوونەوەش دەکرێتەوە."

"تۆ شێتی."

بەم جوابەی دۆستەکەی پێکەنی.

(شێتییەک لە مندایە، جوانترە لە هەموو ژیرییەکانی ئێوە.)

## (٣٦)

**چیرۆکەکەی گێڕایەوە.**

دەستی سالمی پەنجەشینی گوشی، بەدەم دەستگوشینیەوە، باسی کارەکەی خۆی بۆ کرد. دەیویست زمانی ئەو سەردەمە تێک بشکێنێت و زمانێکی نوێ بخاتە ناو نووسینەوە. زمانێک، زمانی خەڵک بێت. زمانێک نەبێت لە دوورەوە هاتبێت، زمانێک بێت لە منداڵییەوە هاتبێت. ئەو زمانەی خەڵکەکە قسەی پێ دەکات، زمانی منداڵییە، ڕۆحی تیایە، هەستی تیایە، ئەتوانرێت بکرێتە زمانی نووسین و شیعر. ئەتوانرێت بکرێتە بناغەیەک بۆ خوێندنەوەی دونیا. کە ئەم زمانە نوێیەی هێنا، ئیتر دونیا کۆنەکە درزی تێ دەکەوێت، دونیا کۆنەکەش درزی تێ کەوت، واتای ئەوەیە بەم زمانە شتی تازە دێتە ئاراوە و ئەتوانرێت ئەوەی بە زمانە کۆنەکە ژەهراوی کراوە، فەرامۆش بکرێت و لە ڕێگەی زمانە نوێیەکەوە دونیا بخوێنرێتەوە.

دۆستەکەی حەپەسابوو. دەمی داچەقاندبوو بەدیاریەوە و قسەی بۆ نەدەکرا. کە قسەکانی ئەو تەواو بوو، حەپەسانەکە بەری دا. پڕ بە دڵی خۆی دایە قاقای پێکەنین. بەدەم

پێکەنینەکەیـەوە بەگاڵتەپێکردنێکـەوە وتـی، "بەڕاسـتی خـەوی خۆش دەبینیت، ئەوە تۆ تـەواوی یان لـەو کێو و شـاخانە چن دەسـتیان لـێ وەشـاندووی؟ تـۆ باسـی چـی دەکەیـت؟"

خۆی تێک نەدا. وتی، "باسی زمان و خەیاڵ دەکەم."

"جا بۆچی ئەم جارەش وەک جاری پێشوو شتێک ناکەیت بەردبارانیشـت بکەن."

"نا... ئەم جارە کـەس بەردبارانـم نـاکات، خەڵکە ئاساییەکە لەگەڵم دەبن، ئەوانەی لەگەڵم دەبن، زۆرترن لەوانـەی دژمن. تەنها ئەوانـە دژم دەوەسـتنەوە کـە قەڵەمیـان پێیـە و بـە زمانـە کۆنەکە نووسیویانە."

"جا بـۆ ئەوانـە بـە کـەم ئەزانیت؟ هـەر ئـەوان نین خەڵکـە ڕەشـۆکەکە هـان دەدەن؟"

"وایە، ئەوانن. چارەی ئەوەشم دۆزیوەتەوە"

"کامە چارە؟"

"ئـەوان خەڵـک هـان دەدەن دژی مـن، منیـش خەڵـک هـان دەدەم دژی ئـەوان."

"ئەی فەرمانڕەواکان؟"

"کێشـەیەک نابێـت. وا بیـرم لـێ نەکردووەتـەوە کـون و قوژبنـەکان نەگـرم. چیـی کـون و قوژبنـە، بـە شـێوازی خـۆی چـارەی دەکـەم."

"وا بزانـم سـەری منیش دەدەی بـە فەتەراتێکدا. ئاخـر براکـەم، مرۆڤ شـێت نەبێت، بیر لـەوە دەکاتـەوە هێرش بکاتـە سـەر زمانێکـی هـەزار سـاڵە و زمانێکـی نـوێ دابهێنێـت. ئەمـە دێوانەیـی نەبێـت، ئـەی چـی دێوانەییـە؟"

(کەشـتییەوانی ڕاسـتەقینە لـە ڕەشـەبا ناترسـێت، لـە ئـاوی مەنـگ دەترسـێت.)




# (٣٧)

**لەناو دوکانەکەدا دانیشتن.**

سالمی پەنجەشین دوو سیغاری پێچایەوە و دانەیەکی دایە دەستی ئەو.

میرزای باڵدار سیغارکێش نەبوو، چەندی کرد وەری نەگرێت، بە زۆر و سوێندخواردن دانەیەکی دا بەسەریدا. بەدەستی خۆی سیغارەکەی بۆ داگیرساند، نەفەسێکی قووڵی ناشییانەی لێ دا، لەتەک هەڵمژینی دووکەڵەکەدا، بە جارێک لە دەم و لووتییەوە دووکەڵ هاتە دەرەوە. دەستی کرد بە کۆکینێک، خەریک بوو جەرگ و هەناوی بێتە دەرەوە. چاوی پڕ بوو لە ئاو، ڕەنگی تێک چوو، ئەویش بەدیارییەوە پێدەکەنی!

"ماڵت ئاوا بێت، خەریک بوو بمکوژیت."

"بەرگەی هیچ ناگریت، ناسک بوویتەتەوە. ناتوانی لە بەردەم دووکەڵی سیغارێکدا خۆت بگریت، ئیتر چۆن دەتوانی ڕووبەڕووی ئەو هەموو سیغارکێشە ببیتەوە!"

"سیغارکێش کێن؟"

"ئەوانەی تۆ ڕووبەڕوویان دەبیتەوە، سیغارکێشن. لێرە هەرکەسێک دەبێت بە شاعیر، سەروقژی خۆی تێک دەدا، دەست دەکات بە سیغارکێشان. خۆشییەکەی لەوەدایە وا دەزانن شاعیربوون یانی خۆخەمگینپیشاندان! کاتێکیش شیعرەکانیان دەخوێنیتەوە، ئەوەی بەلایدا نەچوون، خەمە ڕاستەقینەکانی ئەم دونیایەیە".

میرزا دایە قاقای پێکەنین. پێکەنینەکەی لەو جۆرە پێکەنینانە بوو، کە گاڵتەی بە شتێک دێت و نازانێت چیی لەسەر بڵێت، بۆی پێدەکەنێت. ئاخر شاعیربوون دەنگێکە پەیوەندیی بە هوشیاری و ناوەوەی مرۆڤەوە هەیە، پەیوەندیی بە ڕوخسار و شێوەی کەسەکەوە نییە."

(دونیاکە بووە بە دونیای شێوەکان.)

"سەردەمەکە وای لێ هاتووە، بۆ ئەوەی شاعیرێکی باش دەر کەویت، ڕیشێکی بۆ دەهێڵیتەوە، سەروقژت تێک دەدەی بەسەر یەکدا، داییمەی خوا سیغارێک لەسەر لێوتە و دووکەڵت لێوە بەرز دەبێتەوە. جلێکی ڕەنگاوڕەنگ لەبەر دەکەیت و لە شوێنێک دادەنیشی، خۆت بە خەمگین دەر دەخەیت و لە ناخیشەوە دڵخۆشی تەنگی پێ هەڵچنیویت."

سالمی پەنجە شین لەم جۆرە گاڵتانەی زۆر دەکرد لەسەر نووسەر و شاعیرەکان. میرزاش بەخۆشحاڵییەوە گوێی بۆ شل دەکرد و پێدەکەنی.

تا دەمەو ئێوارە لەسەر گاڵتەوگەپ بەردەوام بوون. چا لەدوای چا هەڵیان دەقوڕاند و هۆدەکەیان قان دابوو. کە هەڵدەستایتە سەر پێ، دووکەڵی سیغارەکان نەیدەهێشت بەباشی بەردەمی خۆت ببینیت.

(تەمێک ژیانی شاردووەتەوە.)

## (٣٨)

بەدەم ڕێوە شتیان دەكڕی.

خۆر بە دوو تەكانی تر دەكەوت بەودیوی كێوەكاندا.

زەردەیەك لەو خوارەوە خۆی ڕاكێشابوو، تا ناوەڕاستی ئاسمانی تەنیبوو. دوو پەڵەهەور لە بەردەم زەردەی خۆرەكەدا وەستابوون. ئەملاو و ئەولای پەڵەهەورەكان لە دوو پشكۆ دەچوو، ئاگریان لێوە بەرز ببێتەوە، سوورێكی تۆخی دەنواند. پۆلێك مەلیش بە ئاراستەی دەشتاییەكەدا قەتارەیان بەستبوو. یەكێك لەپێش هەموویانەوە ملە باریكەكەی خۆی درێژ كردبوو، ئەوانی دیكەش بەشوێنیدا خۆیان نزم دەكردەوە و بەرز دەكردەوە و پەلەی گەیشتنیان بوو بە شەونشینییەكەیان.

بازاڕەكە قەرەباڵغ بوو، كڕیار و فرۆشیارەكان لە گەرمەی مامەڵەكردندا بوون. كۆمەڵێك پاسەوانیش بە خۆیان و دارێك بەدەستیانەوە لەقەراغ هاتوچۆی خەڵكەكە وەستابوون و چاویان لە جموجووڵەكان دەبڕی.

(گەر ئاگات لە خۆت نەبێت، دەبێت بە پاسەوانی ژیانی

خەڵک.)

دۆستەکەی دەمێک تووری دەکڕی، دەمێک وشکە، دەمێک پارچەقوماش، کە ژنەکەی داوای کردبوو. میرزا ئەوەندەی پێ دەکرا کەلوپەلەکانی لێ وەر بگرێت و بیانخاتە سەر پشتی کەرەکەی و دەستیان پێوە بگرێت نەکەون.

هاواری بەقاڵەکان لە دەمەوئێوارانی بازاڕدا، جوانترین دەنگی مرۆڤە. دەنگێکە نە خەمگینە، نە شاد، نە زۆر بەئازارە، نە زۆر نەرم، دەنگێکی پاکە، بۆنی ئەو سەوزانە دەدات، بەسەر گونیە تەڕەکانەوە لەسەر لا، لەتەنیشت یەک پاڵ کەوتوون، دەنگێکی تەڕە. ئەو دەنگە وات لێ دەکات خۆت نەگریت و بە سەوزە و میوەوە بچیتەوە بۆ ماڵ. ئاوازی ئەو دەنگە سفرەی ماڵەکەت سەوز و پڕڕەنگ دەکات. تەنها دەنگی سەربەرزی هێندەی دەنگی بەقاڵەکانی ئێوارانی بازاڕ جوان و پاکە.

لەوسەری بازاڕەکەوە، بەقاڵەکە لەناو سەوزە و میوەکاندا دەسڕێکی ئاوریشمیی تەڕی گرتبوو بە دەستیەوە، بە دەسڕەکەی دەیکێشا بە شانوملی میوە و سەوزەکاندا و هاوارێکی دەکرد، وەرنەوە ئەم جوانییە ببەنەوە بۆ ماڵ، وەرنەوە مەهێڵن سفرەی ماڵەکەت بێڕەنگوبۆ بێت. بە خۆشیی ئەو هاوارەوە، حەزت دەکرد دوکانەکە بگریت بە کۆڵتەوە و بیبەیتەوە.

(ئەوەی جوانیی پێ بەخشیت، گەر تۆزقاڵێکیش بوو، وەری بگرە.)

سالمی پەنجەشین بە کامی دڵی شتی کڕی، بە کۆڵانە پێچاوپێچەکان و دیوارە خۆڵاوییەکانی ئەمبەر و ئەوبەریدا بەرەو ماڵ بوونەوە.

## (٣٩)

**گەیشتنەوە ماڵ، دەستی کرد بە گۆرانیوتن.**

که ژنەکەی دەبینی، پیاوێکی تر بوو.

لە گەنجیدا بەو جۆرەش شەیدا دەر نەدەکەوت، کە لەم تەمەنە کامڵەیدا دەر دەکەوت. نازانم ئەم ژنە چ پەرجوویەکی نواندبوو، ئەو پیاوەی بەو جۆرە لێ کردبوو، ژیانی سەرتاپا بەسترابوو بەوەوە. کەمن ئەو پیاوانەی بەسەختی ژنەکانی خۆیان خۆش بوێت. بە بینینی ژنەکەی، شێوەی هەڵسوکەوت و قسەکردنی دەگۆڕا. چۆن گەنجێک بۆ یەکەم جار لە سووچی کۆڵانێک، یان لە ناوبازاڕێک چاوی بە کچێکی شۆخوشەنگ دەکەوێت و دەست و پێی دەشکێت، بەدڵی خۆی تەماشای دەکات، ئەمیش وا بوو. وات دەزانی یەکەم جارە یەکتر ببینن، یەکەم جارە قسە لەگەڵ یەکتری دەکەن.

مرۆڤ بەخیلیی پێ نەدەبردن، بەڵام پیاو دڵخۆش بوو بەوەی هێشتا لە سەردەمێکدا دەژین، پیاوێکی تیایە بەو شێوە جوانە ژنەکەی خۆی خۆش دەوێت. ژنەکەشی تا حەزکەی نەرمونیان، خانومان، ناسک و میهرەبان. لە دەرگای

حەوشـە دەکەوتین بەودیودا، دەهـات بەپیریـەوە. پەروانەیـەک چـۆن لـەدەوری شـەمعێک دەگەڕێت، بـۆ پیاوەکـەی بووبـوو بـەو پەروانەیـە. شـەمعەکەش بـەدەم قسـەی خـۆش و پێکەنینەوە سـەیری پەروانەکـەی خـۆی دەکـرد.

چاوێکی لـە میـرزا داگـرت و بەگاڵتەکردنـەوە وتـی، "ئادەم بەگاڵتـە دەسـتی لـەو بەهەشـتە هەڵنەگـرت، دەیزانـی ئـەم بەهەشـتە لـەو بەهەشـتە بەهەشـتترە."

میـرزا بەگومانـەوە بەبێدەنگـی لـە بەردەمیـدا وەسـتا. قسـەکەی قسـەیەکی جەرگبـر بـوو، نەیدەویسـت لـە زەوقـی بـدا، پێشـی خـۆش بـوو پێـی بڵێـت، "ئـەم قسـانەش ئەزانیـت." ئەمـا کـە دەیبینـی وەک دوو مـاری عاشقەوماشـقە لـەدەوری یـەک دەخولێنـەوە، پێـی حەیـف بـوو قسـەیەک بـکات کـە لەسـەر دڵیان گـران بێـت.

خێـرا دەسـتی بـرد توورەکانـی شوشـتەوە و دەورییەکـی هێنـا و توورەکانـی قـاژ کـرد و بـە ژنەکـەی وت، "چیـی تـرت دەوێـت بـا بـۆت بکـەم."

ژنەکـەی زەردەخەنەیەکی بـۆ کـرد و لەژێـر لێوەوە تۆزقاڵێک دەنگـی دەهـات، پێـی وت، "تـۆ خـۆت عەزیـەت مـەدە، من بەیانی تـا ئێـوارە بێئێشـم، تۆزێـک ئیسـراحەت بکـە، بـا ئـەم ئیشـانە من بیکەم."

ئەویش هاتـە سـەر سـەکۆکە و پشـتییە خڕەکـەی خسـتە ژێر شـانی و بـەدەم سـەیرکردنی ژنەکەیـەوە نووزەنووزێکـی کـرد.

(خۆشبەختیی گـەورەی خێزانەکان لـە خۆشەویستیدایە.)

میرزا لـە دەری حەوشـە کەرەکـەی بەسـتەوە بـە دارتووەکـەوە و کورتانەکـەی لەسـەر شـانی داگـرت. خۆشـی لەنـاو حەوزەکـەی

قـەراغ حەوشـەکە دەسـت و قاچـی شوشـت و لـەو شـوێنەی بۆیـان دانابوو، پاڵـی دایـەوە. لـە خەیاڵـی خۆیـدا حـەزی دەکرد هاودەمێکی هەبێت، بە شێوەی دۆستەکەی ژیانی پڕ بێت لە خۆشەویستی، ئەما خەمەکانی لەوە گەورەتر بوون بیر لە هاودەمێکی ڕاستەقینە بکاتەوە و تەنها لـە خەیاڵیدا وێنەی کەسێک هەبوو.

(ئەو خۆشەویستانەی لە خەیاڵدا دەمێننەوە، هەمیشەیین.)

## (٤٠)

**پاش نانخواردن کەوتنە باسی دونیا.**

سالمی پەنجەشین قسەکانی بیر نەدەچوو، بۆیە دووبارەی کردەوە و پرسیی، "پێم بڵێ بەنیازی چیت؟"

میرزا دیسانەوە باسی کرد، کە دەیەوێت زمانی خەڵکەکە بگۆڕێت. ئەو زمانەی خەڵک قسەی پێ دەکات، دەکرێت هەمان زمان ببێت بە زمانی نووسین و زمانی فەرمانڕەواکان. ئەم زمانە کۆنەی پڕە لە بێگانەکان، زمانێکە درزێکی دروست کردووە لەنێوان تێگەیشتندا. بۆ ئەوەی درزەکە پڕ بکرێتەوە، دەبێت لە زمانەکەوە دەست پێ بکەیت. چیرۆکێکی گێڕایەوە، چیرۆکەکە هیی سەردەمی دروستبوونی وشە بوو. لە یەکێک لە شارەستانییەتە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتدا، کاتێک هەستیان کرد تەنها ئاماژە بەس نییە بۆ تێگەیشتن، وشەیان داهێنا. وشە زیادەیەک نەبوو، وشە پڕکردنەوەی بۆشاییە گەورەکەی مرۆڤ بوو.

ئەویش قسەکانی پێ بڕی و بەگاڵتەیەکەوە وتی، "خۆ ناشێت خەریکی وێرانە بێت."

"ڕێک وایە، ئەوەی مەبەستمە، وێرانەیە. وێرانەیەک نە

پێویستی بە سوپایە، نە پێویستی بە خوێنڕشتنە، وێرانەیەک وێران دەکەم، خۆی وێرانەیە. ئەم وێرانەیە بووەتە شوێنێک بۆ کەسانێک لەسەری دەژین، دەبێت وێرانی بکەیت، تا کەس لەسەری نەژی و ماڵێکی نوێ دروست بکرێت."

سالمی پەنجەشین و سەروڕیشسپی، بە دەنگی بەرز، بۆ ئەوەی ژنەکەی بەباشی گوێی لێ بێت، هاواری کرد، "خانم گوێت لێیە؟ گوێت لێیە غەریبەیەک لەو شاخانەوە هاتووە، بەنیازی تارومارکردنی ئەم شارەیە، لەوەش خۆشتر دەیەوێت شارێکی نوێ دروست بکات. هاتووە پێمان بڵێت ئەم زمانەی ئێمە سواوە و پێویستە زمانێکی تر فێر بین. ئاخر ئەمە ئەچێتە عەقڵی شێتیشەوە."

ژنەکەی سەوزەی دەچنی، خۆی تێک نەدا و بەنیانییەکەوە جوابی دایەوە، "جا بۆ نا کابرا، ئەم شارە وەختی خۆی دەشت بووە، یەکێک هاتووە دروستی بکات، ڕۆژێکیش دێت جوانتر دەکرێت، کراسێک کۆن بوو، بۆ چی باشە؟"

کە گوێی لەم قسانەی ژنەکەی بوو، هەڵسایە سەر قیچکان، "بەهـ ... بەهـ ... تۆشی وا لێ کرد. ئاخر خانم گیان، ڕووناکیی سینەم، خەونی ژیانم، ئەمە کراس نییە، ئەمە شەڕە شەڕ، شەڕێکە، کەس نازانێت کێ تیایدا پارچەپارچە دەبێت."

میرزا گوێی گرتبوو. ئەوان خەریکی قسەکردن بوون، ژنەکەی شتێکی دەوت و پیاوەکەی شتێکی تر قسەکانی ژنەکەی لەوە نەدەچوون پشتی میرزا نەگرێت. پیاوەکەشی وردەوردە نەرم دەبوو بڕوای پێ بکات.

(گەر پیاوەکان لێگەڕێن، ژنەکان زووتر لەگەڵ نوێگەریدا دەگونجێن.)

## (٤١)

**ژن خۆی شیعرە.**

گەیشتنە ئەوەی یەکلاییی بکەنەوە.

دۆستە سەرسپییەکەی، نیوەی ژیانی نا، زۆربەی ژیانی، بەتایبەت لەو ساتانەی چارەنووسی لەگەڵ کەسێکدا بوو، دابوویە دەستی ژنەکەی. بڕوای وا بوو هەر بڕیارێکی ژیانی لەلایەن ژنەکەیەوە درابێت، سەرکەوتوو بووە تێیدا. ژنەکەی بەدەم چاتێکردنەوە ڕوویەکی لە میرزای باڵدار کرد و بەنەرمی پێی وت، "ئەرێ هەر باسی شیعری تازە و زمانی تازە دەکەیت، هیچیشمان نەدی!"

هێشتا قسەکە لە دەمی نەکەوتبوویە خوارەوە، مێردەکەی هەڵی دایە، "ئەشهەدو ڕاست دەکات، ئەشهەدو وایە، ئەوە دوو ڕۆژە مێشکی منت بردووە، زمانی تازە و شیعری تازە و دونیای تازە، نە تێگەیشتم، نە نووکە وشەیەکیشم بینی. براکەم، پیاوی گەورە کەم قسە دەکات و کاری باش دەکات. لەباتیی ئەم قسانە، بۆ شتێکمان پیشان نادەیت؟"

میرزا دەستێکی خستە ژێر چەناگەی و بەزەردەخەنەیەکەوە

سەیری هەردووکیانی کرد. لە دڵەوە پێی خۆش بوو گەیشتووەتە ئەوەی دوو لە نزیکترین کەسەکانی تامەزرۆ بن شتێکی ببینن. سەردەمی ڕۆیشتنی بۆ کێوەکان، تازە کتێبی *خەونە باڵدارەکانی* نووسیبوو، لەو کتێبەدا خەونەکان قسەیان دەکرد. خەونەکان خاوەنی خەونەکەیان دەبرد بۆ ئەو شوێنەی خەونەکەی تێدا بوو. خەونێکی نەگێڕابوویەوە باڵی نەبێت. کێشەی گەورەی ئەو کتێبە زمانی تێگەیشتنەکەی بوو. زمانەکەی ئاڵۆز بوو. سەردەمەکەش وا بوو، زمانی نووسین و زمانی قسەکردن دوو شتی جیا بوون. ئەوەی بیویستایە ببێتە خوێنەوار، دەبایە پێش هەموو شتێک زمانێک بزانێت. کەس بەو زمانەی قسەی پێ دەکرد، نەیدەنووسی. لە نیوەی ڕێگا بوو، دەنگی باڵندەکان وای لێ کرد وا بیر بکاتەوە دەبێت هەموو مرۆڤێک وەک باڵندەکان بە زمانی خۆی بنووسێت.

لەم خەیاڵانەدا بوو، کەرەکەی لە بەردەرگا دەستی کرد بە زەڕین. بە زمانی خۆی میرزای ڕاچڵەکان و هێنایەوە ناو بەرهەیوانەکە.

(چی دەبوو مرۆڤ عەقڵی هەبێت و زمانی نەبێت؟)

ئەم پرسیارە نیوەی ژیانی لەسەر هەڵچنی، تا دواجار بڕیارەکەی خۆی دا.

کڵۆشەکرەکەی کرد بەناو چایەکەدا و ڕووی کردە خانمە خانومانەکە و پێی وت، "با وا دانێین من شتێکی نوێ پیشانی تۆ دەدەم و بەدڵت دەبێت، دوای ئەوە چی؟"

"کە بەدڵم بوو، یانی بیکەن."

"ئەی تۆ ڕەفیق؟"

"من کەی قسەم هەبووە لە بڕیاری ژنەکەمدا."
"یانی ژنەکەت ڕازی بێت، تۆش ڕازیت؟"
"بۆ نا. ژنەکەم خۆی شیعرە."
"بەهـ .... بەهـ ... دە من ئەو شیعرە بە شیعر ڕازی دەکەم."
"دە تۆ ئەو ڕازی بکە و منیش بار بکە."
هەرسێکیان دەستیان کرد بە پێکەنین.

## (٤٢)

**تیشووەکەی بۆنی شیعری دەدا.**

یەواشێک تیشووەکەی کردەوە. دەستنووسەکانی خۆی دەر هێنا.

چەند جارێک دەستنووسەکانی ئەمدیووئەودیو کرد. گەڕا... لە کۆتاییدا ئەوەی دەیویست، دەری هێنا. بۆنێکی تیانووسەکەی کرد و کەمێک ئەمدیووئەودیوی پێ کرد. بەئەسپایی دایە دەستی سالمی پەنجەشین، ئەویش لەبەر ڕووناکیی مانگەشەوەکە ڕای گرت و لێی ڕاما. بە خەتێکی قورسی شکستە نووسرابوو. ڕەشیی خەتەکە لەچاو زەردیی تیانووسەکە، لەبریی شیعر، لە نیگارێک دەچوو. سەرسامانە لە شێوەی نووسینەکە و جوانیی ڕەشییەکە بەبێدەنگی سەیری دەکرد.

بەدەم سەیرکردنی تیانووسەکەوە، لەژێر چاوەوە تەماشایەکی میرزای باڵداری کرد. تەماشاکردنەکەی نیشانەیەک بوو بۆ سەرسامی. ئینجا بەدەم لێوجووڵاندنەوەی دەستی کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکە. لە سەرەوە بۆ

خوارەوە خوێندیەوە. تێری نەخوارد، دیسان لە سەرەوە بۆ خوارەوە خوێندیەوە. لەم بێدەنگییەی ئەو و دەنگی سیسرکەکانی ناو حەوشەکە ژنەکەی بێئۆقرە کردبوو. خۆی نەگرت و بەنازێکەوە وتی، "ئەرێ پیاوەکە چی بوو؟ دە شتێک بڵێ؟ خۆ من دڵم تەقی؟"

تیانووسەکەی گرت بە دەستە چەپیەوە و وەڵامی ژنەکەی دایەوە، "چی بڵێم ژنەکە. لە گەنجییەوە تا ئێستا لەناو کتێبدام، هەزاران دەستنووسم کۆ کردنەوە و بەم دەستانەی خۆم کردمن بە کتێب. هەزاران وشەم ئەمدیوئەودیو کرد. بڕوا دەکەیت تا ئەم تەمەنەش شتێکی وا جوانم نەدیوە. قەت لەو بڕوایەدا نەبووم ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێک بێت ئەم زمانی قسەکردنەی خۆمان بکات بە نووسین، جا ئێستا ئەو کەسەش ڕەفیقێکی خۆم بێت. ئەک دەستەکانی خۆش، ئەمە کارە. لەبەر دڵی تۆ ناڵێم، بە گیانی تۆ ئەم شیعرە خەریکە هێندەی تۆ جوانە."

میرزا گوێی شل کردبوو. خۆی دڵنیا بوو لەوەی کارەکەی جوانە، زەحمەتیشە. بیری لەوە کردەوە کەسێک خۆی ئەهلی ناو کتێبەکان بێت، یەکسەر بە نووسینێکی تازە سەرسام بێت، زۆر جێگای دڵخۆشی نییە. ئەوەی جێگای دڵخۆشییە کەسێک سەرسام بێت، وشەناس نەبێت و بە وشەی تازە سەرسام بێت.

ژنەکەی داوای کرد بۆی بخوێنێتەوە. ئەویش گەرچی بەباشی نەیدەزانی ئاوازی وشە تازەکان دەر بڕێت، دەستی کرد بە خوێندنەوە. لە کۆتاییدا وەستا. ژنە چاوەڕوان بوو نەوەستێت. ویستی دەستنووسەکە بخاتە لاوە، ژنە دیسان

داوای لێ کرد سەرلەنوێ بیخوێنێتەوە، ئەویش دووبارە خوێندیەوە.

هەردووکیان پێکەوە سەیریکیان کرد. دڵخۆش بوون میوانێک لە ماڵەکەیاندایە، هەگبەکەی هێندە تازەیە، یەک سەردەم و یەک شەڕی گەورەی دەوێت تا ئەو هەگبە تازەیە بچێتە ناو هەموو ماڵێکی شارەکە.

(وشە، کە تەڕ و بەهێز بوو، بۆنی تازەیی دەدات.)

تاوێک بێدەنگی... کەسێک قسەی نەدەکرد... جگە لە شنەبایەک و سیسرکەکان، دەنگی هیچ نەدەهات.

# (٤٣)

**دەنگی کەڵەشێرەکە هەواڵی ڕۆژێکی نوێی هێنا.**

بەپەلە میرزای لە خەو هەڵساند. ئەوەندەی ئەو پەلەی بوو، میرزا پەلەی نەبوو.

نانوچایەکی سادەیان خوارد. میرزا خەریکی کۆپانی کەرەکەی بوو، ڕەفیقەکەی هاتە لایەوە و داوای لێ کرد ئەمڕۆ کەرەکەی نەهێنێت. بە داواکەی ڕازی نەبوو. ڕاستییەکەی، هێندە پێکەوە ژیابوون، بەبێ یەکتری ڕەوتی ڕۆیشتنیان تێک دەچوو. کەرە بۆر کۆپانی خرایە سەر و کەمێک گیای تەڕیش خرایە بەردەمی تا بە سکی خاڵییەوە بەناو کۆڵانەکانی شاردا نەیگەڕێنێت. بەدیارییەوە وەستان تا ژەمی بەیانیی خوارد.

ڕەشووی کەرەکەی گرت بە دەستییەوە و کەوتە شوێن ڕەفیقەکەی. ڕاستەوڕاست بەرەو مزگەوتە گەورەکەی ناوەڕاستی شار ڕۆیشتن. لەسەر دیواری مزگەوتەکە، بە خەتی کوفی، هەزاران ئایەت و ناوی خەلیفە و پیاوانی ئەو بیابانە نووسرابوون. لەسەر تاقی مزگەوتەکەش پڕ بوو لە کتێبی ڕەنگزەردی سەدە کۆنەکان. یەکێک لە کتێبەکانی دەر

هێنا و بە زمانێکی بێگانە نووسرابوو. دایە دەستی میرزا و پێی وت، "ئەم کتێبانە دەبینی، ئەمانە هیچیان بە زمانی خۆمان نین. نازانم بۆچی پێشووتر کەسێک نەهاتووە بەم زمانەی خۆمان بنووسێت. خراپیی ئەم زمانە چییە؟ گوناهی ئەو خەڵکەش چییە لەم کتێبانە تێناگەن و نازانن مەسەلە ڕاستەقینەکە چییە؟"

میرزا بەگومانەوە لێی ڕوانی. دوای سەیرکردنێکی ساردی کتێبەکە، خستیەوە شوێنی خۆی و دەستی کرد بە قسەکردن، "هەمیشە دەبێت کەسێک بێت پەردەکە لا بدات، بۆ ئەوەی خەڵکەکە بەباشی ببینن. من ناڵێم شتی گەورەم کردووە، تەنها لە دەنگی باڵندە و گیانلەبەرە کێوییەکانەوە فێر بووم، پێویستە هەموو ڕۆحلەبەرێک بە زمانی خۆی بدوێت. ئەوانەشی ئەتوانن بنووسن، هەر بەو زمانە بنووسن. زمانێک لەم سەرزەمینەدا نییە لە زمانەکەی تر پیرۆزتر و خۆشەویستر بێت لای خودا. ئەو قسە کۆنانە بەسەر چوون، کە پێشتر لە حوجرەکان دەمانبیست. زمانەکەی خۆمان زمانی خودایە. مادام زمانی خودایە، بۆچی بە زمانی خودا قسە نەکەین و نەنووسین؟"

"تۆ ڕاست دەکەی میرزا. بڕوا دەکەیت ئەمشەو خەوم لێ نەکەوت. باشە بۆچی من لەباتیی تۆ بیرم لەم کارە نەکردەوە؟"

"جا حەز دەکەی با بۆ تۆ بێت؟"

"نە، شتی وا نابێت، بەخیلیت پێ نابەم. ئەوەی پێم بکرێت دەیکەم. ئەمڕۆ بۆیە هێنامی بۆ ئێرە، تا بزانی تەنانەت بە زمانی خۆشمان ئایینەکەمان پێ ناگات. خودا بکات تۆ شتێک

بکەیت و لەم شوێنەوە گوێم لێ بێت بەم زمانەی خۆمان باسی خودا بکرێت."

"سەبرت هەبێت، سەبرت هەبێت. کارێک ناکەم خەڵکەکە پێی خۆش نەبێت. دوێنێ لەم مزگەوتە ناسراوێکی کۆنی خۆمم دی، شەو لایان بووم. ئەمڕۆ دیار نییە."

"لێگەڕێ، کاتی ئەوە نییە."

تا نیوەڕۆکەی زۆر شوێن گەڕان. یەکێک لەو شوێنانەیان نەدۆزییەوە دەستنووس و کتێبەکانی بە زمانی بێگانەکان نەبێت.

(من کە خۆم زمانم هەبێت، بۆچی چاوەڕێی تۆ بم قسەم بۆ بکەیت.)

## (٤٤)

**دوو دەنگخۆشیان بەکرێ گرت.**

بەرەو دوکانەکە ڕۆیشتن. دەرگای دوکانەکەی کردەوە و فەرمووی لە میرزای باڵدار کرد. خۆیشی ڕۆیشت. لەوە زۆرتری پێ چوو کە دەچوو بۆ چاهێنان. کاتێ گەڕایەوە، دوو کەسی لەگەڵ بوون. دوو کەسەکەی هێنایە ژورەوە و بە میرزای وت، "ئەم دوو ئازیزە برێک پارەیان دەدەمێ و ئیشێکمان بۆ دەکەن."

میرزای پرسیی، "چی ئیشێک؟" ئەویش وتی، "ئەمانە دەنگخۆشن. لەسەر ئەو سەکۆی شیعرە ئەو دەستنووسە بخوێننەوە کە دوێنێی شەو من بینیم."

میرزا پێی ناخۆش بوو. بەدەموچاوگرژییەوە ناڕەزاییی خۆی لەو کارە دەر بڕی. سالمی پەنجەشین بە پاڕانەوەوە هاتە بەردەمی و تێی گەیاند، "ئەمە بڵاوبوونەوەیە. ئێمە ڕێگای ترمان نییە بۆ بڵاوبوونەوە. هەیە و نییە تەنها ئەمەیە. ئەم کارەش تۆ نایکەیت، خۆم دەیکەم. ئیشەکەم لێ تێک مەدە با بیکەم."

بەناڕەزاییەوە لێگەڕا ئیشەکە بکات.

دەستنووسەکەی دەر هێنا و دایە دەست دوو دەنگخۆشەکە. کە خوێندیانەوە، بەحەپەساوی لە بەردەمیاندا وەستان. یەکێکیان وتی، "ئەمە چییە؟"

سالمی پەنجەشین جوابی دایەوە، "ئەوە شیعری نوێیە، بەو زمانەی کە خۆت قسەی پێ دەکەیت."

"دەزانم و لێی تێدەگەم، کێشەم ئەوە نییە، کێشەکەی من ئەوەیە، ئەمە خەڵک گوێی لێ دەگرێت؟"

"با تاقیی بکەینەوە. ئێوە ئیشی خۆتان بکەن و پارەی خۆتان وەر بگرن. دوایی چی ڕووی دا، لێی گەڕێن بۆ ئێمە."

دوو دەنگخۆشەکە بەملتەکاندنێکەوە دەستنووسەکەیان بردە دەرەوە و چوونە سەر سەکۆکە. ئیشی خۆیان بوو چۆن خەڵک کۆ بکەنەوە. خەڵی لەدەوریان کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکە. میرزا بەدوودڵی لەژێر چاوەوە لە سووچێکی دەرگاکەوە سەیری دەکردن و چاوەڕێی کاردانەوەی خەڵک بوو. لە دەستپێکی شیعرەکەوە تا کۆتاییەکەی، خەڵکەکە کشومات گوێیان گرت. لە کۆتاییی شیعرەکەدا مقۆمقۆیەک پەیدا بوو. پیرەپیاوێک دەنگی بەرز کردەوە، "دەستی ئەوە خۆش بێت ئەمەی نووسیوە، ئەمە ڕێک زمانی ئێمەیە. خۆزگە ئەوانی تریش چاویان لێ دەکرد." لەولای ئەوەوە دەستگێڕێک هاتە جواب، "وەڵڵا خۆ من تێگەیشتم، چونکە زمانی خۆم بوو. بەس ئەمە هەرکەسێک نووسیویەتی، حەزی لە ئاژاوەیە. دەیەوێت میراسیی چەندسالەی شیعرەکانمان تێکومەکان بدات."

(زۆرێک لە تێگەیشتنە گەورەکان، لە مرۆڤە سادەکانەوە

هەڵدەقوڵێن.)

دوو دەنگخۆشەکە بەردەوام بوون و خەڵک لەدەوریان کۆ دەبوویەوە و هەریەکە بەپێی عەقڵی خۆی شتێکی دەوت. میرزاش بەنائارامییەوە سەیری دیمەنەکەی دەکرد و گوێی دەگرت.

# (٤٥)

**فرۆشتنی سێ دەستنووس.**

یەکێک لـە دەنگخۆشـەکان هاتـە ژوورەوە و کڕیارێکـی لەگـەڵ بـوو.

کڕیارەکە پیاوێکی سـەروڕیش ماشوبرنجی بوو. دەستێک جلی پاکوخاوێنی لەبـەردا بوو. بە شێوەیدا لە خانـەدان دەچوو. دەستنووسـەکەی خستە سـەر مێزی کتێبفرۆشـەکە و بە پەنجە خڕ و ئەسـتوورەکانی دەسـتی خسـتە سـەر و بـە دەنگێکـی کەمێک خـاوی گڕەوە وتـی، "ئەمـەم بۆ بنووسـەوە و پارەکـەی چەنـدە دەیـدەم. کوڕێکـم هەیـە ئەهلـی ئـەدەب و نووسـینە، دەمەوێت پیشـانی بـدەم و فێری بکـەم نووسـین بـە زمانـی خـۆت لای کەسـێک عەیبـە خـۆی لـە بـەردەم بێگانەکانـدا بـە بچووک بزانێت. من ناڵێم میراسـەکەی ڕابردوومـان زمانەکـەی بێگانەیە، بەشـێکی بـە زمانی خۆمانـە و بەشـێکی زۆریشـی بە زمانی خۆمـان نییـە. حەیفـە ئـەوەی لـە مێشـکماندایە بـە زمانـی خۆمـان نەبێت."

قسـەکانی بەتەواوەتـی نائارامییەکـەی میـرزای ڕەوانـدەوە.

سالمی پەنجەشین دەستی کرد بە نووسینەوەی و لە کۆتاییی شیعرەکەدا خاڵێکی دانا و بە میرزای وت، "حەز دەکەی بە چ ناوێکەوە بێت." ئەویش بەشەرمێکەوە وتی، "بنووسە (نالیی باڵدار)."

خەریکی نووسینی ناوەکە بوو. پیاوەی کڕیار، کە لە خانەدان دەچوو، ڕووی کردە میرزا و پرسیی، "ئەمە ئیشی تۆیە؟"

"بەڵێ قوربان."

"دەی باشت کردووە میرزا گیان، هەرشتێکی تازەت هەبوو، ئاگادارم بکەنەوە. ماڵی من کەوتووەتە پشت کۆشکەکەی میرەوە، لەتەنیشت حەمامە کۆنەکەیە. خۆم لەم بازاڕە دوو-سێ دوکانی کوتاڵ و وشکەم هەیە، قافڵەچیم. شارانی زۆرم دیوە، خەڵکی زۆرم دیوە، هەمیشە خەفەتی ئەوەم خواردووە، بۆچی ئەوان شەرم لە زمانی خۆیان ناکەن و ئێمە شەرم دەکەین. شوکرم ئەمڕۆ بینیم میرزایەکی هەژار هاتووە بە زمانەکەی خۆمان دەنووسێت. ئەوەی بە من بکرێت، لە خزمەتتدام."

میرزا زۆر سوپاسی کرد و دەستنووسەکەی لوول کرد و بەڕێزەوە دایە دەستی. ئەویش لەناو توورەکەکەی لاقەدی بڕێک پارەی دەر هێنا و خستیە سەر مێزەکە و خواحافیزیی کرد.

هەر کە ئەو ڕۆیشت، دووانی تر هاتن. لەم نووسین و فرۆشتنەدا، سالمی پەنجەشین بەکەیفێکەوە سەری لەسەر تیانووسەکان دادەنەواند و دەینووسینەوە، ئەتوت عاشقی وشەکان بووە و دەیەوێت ڕۆحی خۆی بخاتە ناویانەوە.

ئەو ڕۆژە تا ئێوارە سێ دەستنووسیان فرۆشت. پارەی دوو دەنگخۆشەکەیان دا و ئاگاداریان کردنەوە سبەی، بە هەمان شێوە، پاشنیوەڕۆکەی بگەڕێنەوە بۆ هەمان کار. ئەوانیش بەخۆشحاڵییەوە قبوڵیان کرد.

(هەنگاوی یەکەم سەختترین و قورسترین هەنگاوە.)

پارەکانی کۆ کردەوە و دیسانەوە بەگاڵتەپێکردنەوە وتی، "نالیی باڵدار، تۆ هەمیشە وەک باڵندەیەک بوویت، ڕۆژێک تۆم نەبینی بەبێ فڕین و بەبێ باڵ." نالیی باڵدار دەیزانی دەیەوێت سەر بخاتە سەری، لەبریی وەڵامدانەوە، زەردەخەنەی بۆ دەکرد.

## (٤٦)

دەوری سەکۆکە خەڵکی لێ بوو.

یەکێک لە دەنگخۆشەکان باریکەلەیەکی باڵابەرز بوو، دەستەکانی درێژ، ڕوخسارێکی باریکی ئەسمەر و تۆزێک ڕیشی هەبوو. قژە لوولەکەی لەژێر مێزەرەکەیدا خولیان خواردبوویەوە. دەستنووسەکەی گرتبوو بە دەستیەوە و بەئاوازێکەوە شیعرەکەی دەخوێندەوە و لەگەڵ خوێندنەوەیدا دەستەکەی تریشی با دەدا. خەڵکی ناو بازاڕەکە ئاواز و شیعرەکەیان پێ خۆش بوو. دوکاندارەکانی ئەمبەر و ئەوبەری و لای سەکۆکەش، لە بەردەم دوکانەکانیان وەستابوون و گوێیان دەگرت.

یەکێک لە دراوسێی دوکانەکان هاتە ژورەوە و بە ناڵیی باڵداری وت، "ئەم دوو ڕۆژە ئەم ناوەت ئاوەدان کردووەتەوە. من زۆر شت نازانم و کەمێک بێخەبەرم لە نووسین و شیعر. بەس خوا هەڵناگرێت، ئەم دوو ڕۆژە ئەم شیعرانەم گوێ لێ بووە، لەخۆمەوە حەزم لە شیعرە. ئەزانی زۆر خۆشە شیعرێک بە زمانی خۆت نووسرابێت بیخوێنیتەوە و گوێی

لێ بگریت. خۆزگە خوێندەواریم هەبا."
سالمی پەنجەشین سەیرێکی نالیی باڵداری کرد و وتی، "سەیرکە ڕەفیق... سەیرکە. ئا ئەمەی هاتە ژورەوە و باسی شیعری کرد، هەرگیز نە گوێی لێ گرتووە و نە بۆی گرنگ بووە. دڵنیام ئەمڕۆش بازاڕمان دەبێت."
هەر واش بوو، چەند کڕیارێک هاتن و دەستنووسیان کڕی. لەناو کڕیارەکاندا دوکاندار و دەستگێڕیشی تێدا بوو. هەندێکیش لەوانەی لە دەوری سەکۆکە کۆ بووبوونەوە، هێندە شتەکە لایان تازە بوو، وەریان نەدەگرت و نەشیاندەزانی چۆن ڕەدی بکەنەوە.
ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی هێمن بوو. نالیی باڵدار پێی ناخۆش بوو شیعرەکانی ببوون بە بازاڕ و دەفرۆشرێن. چاریشی ناچار بوو، دەبێت بەگوێی هاوەڵەکەی بکات. بەڵام غرووری ڕێگەی پێ نەدەدا نە خۆی بچێت بیانخوێنێتەوە، نە حەزیش بکات ئەو کڕیارانە بزانن کاری ئەوە.
(ئیشی خۆت بکە، هەموو ئیشێکی باش شوێنی خۆی دەگرێت.)
شەوەکەی لە ماڵی سالمی پەنجەشین بە یەکێک لە شەوە خۆشەکانی هاتە بەرچاو، ژنەکەی کەیفخۆش بوو بەوەی خەڵک شیعرەکانی بەدڵە. لای ژنە دراوسێکانیشیان باسی کردبوون و زووزووش ناوی نالیی دابوو بەگوێیاندا. خۆی وتەنی، "هەرچی ویستت زوو بگات بە خەڵک، بیخە دەمی ژنانەوە. هەفتەیەکی پێ ناچێت، ئەم شارە دەبێت بە باسی ئەو."
شتێکیش زۆر دڵی خۆش دەکرد، ئەوە بوو دۆستەکەی

بازاڕی بۆ پەیدا بووبوو. لەو دەستنووسانەشی فرۆشتبوویان، یەک قەڕانی لێ وەر نەگرتبوویەوە. خەونەکەی ئەو گۆڕینی زمانێک بوو، نەک گۆڕینی ژیانی خۆی.

(ئەوەی خەونی گەورەی هەبێت، ژیانی خۆی بیر دەچێتەوە.)

## (٤٧)

**بازاڕ گەرم بوو.**

هەوایەکی خۆش، نە کزەی هەبوو، نە گەرم بوو.

بۆنی سەوزەی تەڕ و میوەی تازە کڕیارەکانی بۆ خۆی ڕادەکێشا. هەردووکیان لەناو دوکانی کتێبفرۆشییەکە دانیشتبوون. سالمی پەنجەشین، کە سەروڕیشی سپی بووبوو، کڵاوێکی ڕەنگاوڕەنگی دەستچنی ژنەکەی خستبوویە تەوقی سەری. دەموچاوێکی باریکی شیرین، دوو چاوی ڕەشی بچکۆلە چووبوون بە قووڵییا. توێڵی وردە وردە دەر پەڕیبوو و تووکەکانی ئەملا و ئەولای توێڵی هەڵوەریبوون و وردە وردە نێوچاوانی درێژتر دەبوو. قامیشێک بەدەستیەوە، دەژەند بەناو جامە مەرەکەبەکەدا و بەهێواشی خەریکی نووسینەوەی شیعرێکی نوێ بوو. نالیی باڵداریش وەک چۆن دادەنیشت بەوردی سەیری سروشتی دەکرد، ئاوا سەیری پەنجە شینەکانی دۆستەکەی دەکرد. دووراودوور خزم بوون، بەس ئەوەندەی دۆستایەتییەکەیان بەلاوە گرنگ بوو، خزمایەتییەکە نەدەبووە هۆی نزیکییان.

دوو دەنگخۆشەکە لەسەر سەکۆکە وەک کەو دەیانخوێند. خەڵکێکی زۆر لەدەوریان کۆ بووبوویەوە. کتوپڕ بوو بە هەڵلا، دەنگەدەنگەکەی دەرەوە ئارامیی ئەمانی تێک دا. بەپرتاو چوونە بەردەرگاکە، بینییان دوو کەس بە شێوەی زۆر خراپ باسی شیعرەکان دەکەن و یەک-دووانێکیش لێیان هاتوونەتە جواب. نە ئەوانە دەناسران کە هاتبوونە جواب، نە ئەوانەش کە دژی شیعرەکان بوون. لەو بەینەدا فڕکان فڕکان پەلاماری یەکتریان دەدا و یەخەی یەکتریان گرتبوو، ئەمانیش نەیاندەزانی چی بکەن.

(زەوی زۆر جوان دەبوو، گەر مرۆڤ تووڕەبوونی خۆی لەبیر بکردایە.)

هەرچۆنێک بێت، خەڵکەکە کەوتنە بەینیان و دوو دەستەکەیان لەیەک جیا کردنەوە. ئەمانیش لەمبەرەوە سەیریان دەکردن. دوای جیاکردنەوەی پەلاماردەران، یەکێک لە دەنگخۆشەکان هاتە ئەمبەر، ڕەنگی تێک چووبوو، بە زمانێکی وشکەوە باسی شەڕەکەی کرد، "ئێمە خەریکی خوێندنەوە بووین، کاتێکمان زانی دوو کەس کەوتنە گوتنی قسەی ناشیرین، تێنەگەیشتین بۆ وا دەکەن. هەوڵمان دا ئارامیان بکەینەوە، سوودی نەبوو، قوربان دیار بوو بۆ شەڕ هاتبوون. ئیتر دوو-سێ کەسی تر لێیان هاتنە جواب. قوربان، بە خودا گوناهی ئێمە نەبوو، ئێمە بەباشی کارەکانمان دەکەین."

سالمی پەنجەشین دەستێکی هێنا بە سەریدا و دڵنەواییی دایەوە، "گوێی مەدەنێ، خۆتان لە شەڕ لا بدەن. ئێوە کاری خۆتان بکەن. شتێکیش ڕووی دا، بەهێمنی سەکۆکە جێ بهێڵن

و وەرنەوە بۆ دوکانەکە."

دەنگخۆشەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای هاوڕێکەی و ئەمانیش بەگومانەوە سەیرێکی یەکتریان کرد.

(سەرەتای هەتاوی بەیانی، ڕوناکییەکەی لە هەموو کات زیاترە.)

## (٤٨)

**زمانە نوێیەکە بوو بە حیکایەت.**

بە چەند ڕۆژێکی کەم، شیعرەکان و دەنگۆی زمانە نوێیەکە دەماودەمیان دەکرد.

هەندێک کەس دەهاتن بۆ دوکانەکە و بە شانوباڵی شیعرەکاندا هەڵیان دەدا. هەندێکیش تێنەدەگەیشتن و هەر ئەوەیان دەزانی شاعیرێک پەیدا بووە و بە زمانی خەڵک دەنووسێت و ئیتر خەڵک دەتوانێت بەو زمانەی قسە دەکات بنووسێت. ئەوانەشی ئەهلی کتێب بوون، یەکی چەکوشێکیان خستبوویە زمانیان، لەناو چایخانەکان بە سەروگوێلاکی شیعرەکاندا دەهاتنە خوار. یەکێکیان دەیگوت، "ئەوە سەبکە فارسییەکەیە. هاتووە بەو سەبکە فارسییەوە شیعر بە زمانی خەڵک دەنووسێت. بەداخەوە سەبکە کوردییە ڕاستەقینەکەی لەبیر کردووە، بریا بیتوانیبایە بە سەبکە کوردییەکەوە بنووسێت." ئەوەی بەرامبەریشی هەڵی دەدایە و بێڕەحمانە پەلاماری زمانەکەشی دەدا، "بابە خۆ زمانەکەی کوردی نییە، تا وشەیەکی کوردی دەدۆزیتەوە، سەد وشەی بێگانە

دەدۆزیتەوە، خۆم دوو-سێ دەستنووسیم دیوە."

هەندێک هەرچیوپەرچییشیان ڕاسپاردبوو بە بەردەم دوکانەکەدا تێپەڕن و بەتانەلێدانەوە بڵێن، "ئەمە ئەو دوکانەیە، کە خەریکی کوێرکردنەوەی مێژووەکەمانە." چ نالیی باڵدار و چ سالمی پەنجەشین، بەباشی گوێیان لە قسەکانیان بوو، ئەما خۆیان تێنەدەگەیاند و دەیانزانی ئەمانە نێردراون و دیارە ئیشەکە کاریگەریی خۆی هەبووە.

سالمی پەنجەشین خۆی خەڵکی شارەکە بوو، خزم و ناسراوی زۆری هەبوو، لەناو میرنشینەکەشدا خەڵکی دەناسی. وەک نالیی باڵدار نەبوو لە غەریبییەوە هاتبێت و غەریب بێت بە شارەکە. بۆیە ئەویش هەڵسا کۆمەڵێک لە خزم و ناسراوانی خۆی ڕاسپارد، بچن بۆ چایخانەی شاعیر و نووسەرە کۆنەکان، دەست بکەن بە گاڵتەپێکردن پێیان و ئاگاداریان بکەنەوە زۆر قاچ ڕانەکێشن.

(هەمووکەس بە کەرەستەی خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکە.)

هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبوون ئاوا بەخێرایی زمانەکە بڵاو ببێتەوە. هەندێک جار نالیی باڵدار بە هێمنی و خۆشحاڵییەوە باسی لەوە دەکرد، گەر ئەم زمانە شوێنی خۆی بگرێت و ببێتە بناغەیەک بۆ بیرکردنەوە، ئیدی وردەوردە خەڵک لەو دەردە کۆنانەی چۆتە ناو ژیانیانەوە، ڕزگاریان دەبێت. بیری لەوە نەکردبوویەوە ڕۆژگارێک دێت هێندە ئازاری دەدەن، لەنێوان خەونەکەی و خۆیدا دەبێت بە هەڵمێک و ون دەبێت.

خەڵکەکە شیعرەکانیان پێ خۆش بوو. زمانەکەشیان قبوڵ کرد. فرۆشتنی دەستنووسەکانی بە نرخێکی هەرزان، هانی

خەڵکی دەدا بیکڕن.

(بۆ ئەوەی زووتر بگەی، بیر لە گەیشتنەکە بکەوە، نەک شێوازی گەیشتنەکە.)

## (٤٩)

**هێشتا دەمەوبەیان بوو.**

لەناو دوکانەکە دانیشتبوون، سالمی پەنجەشین خەریکی نووسین بوو.

لە گۆشەکەی سەرەوە، نالیی باڵدار کتێبێکی لەناو ڕەفەکە دەر هێنابوو و خستبوویە باوەشیەوە. کتێبەکە یەکێک بوو لەو کتێبانەی لەسەر ڕێزمانی فارسی لەناو حوجرەکاندا دەخوێنرا. لە سەرنجی بۆ سەر کتێبەکە، هات بە سەریدا بیر لە هەمان ڕێگا بکاتەوە بۆ دروستکردنی وانەی ڕێزمان لەسەر زمانە کوردییەکە. کێشەکەی ئەوە بوو، ڕێزمانە فارسییەکە بزوێنی تیا نەبوو، بەڵام ئەم زمانە کوردییە پڕ بوو لە بزوێن. کاتیشی نەبوو هەڵسێت سەرلەنوێ نەخشە بۆ زمانێک دابنێت، کە خۆی هێشتا زمانەکە بەباشی قبوڵ نەکراوە و خەریکە نەیاری بۆ دروست دەبێت.

بیستبووی پێش خۆی، لە یەک-دوو دیوەخاندا، هەمان زمان لە گێڕانەوەی داستانە کۆنەکاندا بەکار هاتووە. بەڵام نەبووە بە نووسین و بڵاو ببێتەوە. شانازییشی بە خۆیەوە

دەکرد، کە ئەم یەکەم کەس بووە ئاوا بەڕوونی و بەبێ ترس دەستی پێ کردوە و پشتی لە مێژوویەکی هەزار ساڵە کردووە و لە سەرەتاوە دەستی پێ کردووەتەوە. هێشتا کتێبەکە لە باوەشیدا بوو، لە خەیاڵی نەخشەی ڕێزماندا ڕۆ چووبوو. دەنگی دوو کەس هات. سەری بەرز کردەوە، دوو پاسەوان بوون. یەکێکیان کەتەی ورگن، ئەوی تریان باریکەلەیەکی ملباریک. کەتەکە هاتە پێشەوە و دەستی لەسەر مێزەکە دانا.

ئەمان بەحەپەساوییەوە سەیریان دەکرد. چاوەڕێ بوون پاسەوانەکە شتێک بڵێت. ڕاستییەکەی، چاوەڕێی شتی خراپ بوون. کەچی بە پێچەوانەوە. پاسەوانە قەڵەوەکە شێوەی شتێکی تر بوو، زمانی شتێکی تر. کە پرسیی کامتان نالیی باڵدارن، سالمی پەنجەشین ویستی هەڵسێتەوە جوابی بداتەوە، نالیی باڵدار کتێبەکەی داخست و چوویە بەردەمی و سەری بەرز کردەوە و وتی، "منم."

پاسەوانە قەڵەوەکە باوەشێکی پێدا کرد و یەک ماچی نێوچاوانی کرد.

کە ئەو ماچەکەی کرد، هەر چۆن سەرتاپا ,دڵەڕاوکێی هاتنی دوو پاسەوانەکە سەرسامی کردبوون، ماچەکەش سەرسامی کردن. پاسەوانەی قەڵەو بە زمانێکی فسی شیرینەوە دەستی کرد بە قسەکردن، "ڕاستییەکەی، گەورەم منی ناردووە. گەورەم وتی قەرزارم بیت ئەگەر ماسیکی نەکەیت. داواسی کردووە دەستنووسێکی بۆ ببەم. بەڕاستی جەنابت کاری باست کردووە. من ئەرکەکەی خۆم سێبەسی کرد. ماسەکەم کردیت و دەستنووسەکانیسم بۆ حازر کەن و

نرخەکەی هەرسەنیک بوو، لە خزمەتانم."

ئەمانیش نەیانپرسی گەورەکەت کییە و بۆچی وا دەکات. دوو دەستنووسی ئامادە لەوی بوون، دایانە دەستی و پارەکەیان دانا و رویشتن. سالمی پەنجەشین دایە قاقای پیکەنین و بەدەم پیکەنینەوە وتی، "مالی ئاوا بیت، کورە کە هاتنە ژوورەوە روحم چوو. وتم خودایە شتیکمان نەکردبیت سەرمان بچیت بە قوردا."

(مرۆڤەکان بە شیوەیاندا ناناسرینەوە، بەزمانیاندا دەناسرینەوە.)

# (٥٠)

**نزیکەی عەسر بوو.**

خەریکی کار بوون. تازە شیعرێکی نوێی نووسیبوو.

شیعرەکە ستاییشکردنی فریشتەیەک بوو. فریشتەیەک نە مرۆڤ بوو، نە فریشتەی ڕاستەقینە. لە شوێنێکی شیعرەکەدا پیاهەڵدانەکان و ناوونیشانەکان وایان لێ دەکردیت بڵێیت ئەمە مرۆڤە، لە شوێنێکی تردا دەیگۆڕی و دەبوو بە فریشتە. مەبەستەکەشی خۆی بوو. خۆیی ناو خەونەکانی. لەناو خەونەکانیدا خۆی دوو بەش بوو، بەشێکی مرۆڤ و بەشێکی فریشتە. بەردەوامیش باڵی هەبوو. لە شیعرەکەشدا هەمان دیمەنی بە وشە نەخشاندبوو. خەریکی باسکردنی شیعرەکە بوون، کۆمەڵێک کەسی چڵکن هاتنە ژوورەوە.

بەبێ سەلام و کەلام بەناو کتێبخانەکەدا بڵاو بوونەوە. یەکێکی چڵکنی ڕیشداری سەروقژبڕاو لەپێش هەموویانەوە بوو. لە بەردەم مێزەکە وەستا و ئەوانیش بەگاڵتەپێکردنەوە سەیری نالیی باڵداریان دەکرد و زەردەخەنەیان دەکرد. هیچ خۆی تێک نەدا و ڕووی کردە ڕیشدارەکەی پێش هەموویان

و بەغرووڕەوە وتی، "ئەدەبی سەلام فێر نەبوون!"
کابرا بەم قسەیە ڕەنگی تێک چوو. یەکسەر چووە سەر بابەتەکە و دەستی پێ کرد، بەنیگەرانییەوە وەڵامی دایەوە، "ئەی تۆ ئەدەبی وێرانکردنی مێژووی ئێمە فێر نەبوویت؟"
"من مێژووی ئێوەم وێران نەکردووە. هەرچی بوو بە مێژوو، لەناو مێژوودا دەمێنێتەوە."
"تۆ ئێمە دەناسی؟"
"نەخێر، نازانم ئێوە کێن."
"ئێمە شاعیرانی ئەم چەرخەین!"
"عەجایب... شاعیران خەمی مێژوویانە یان خەمی ئایندە؟"
"خەمی هەرچیمان بێت، دەزانین چی دەکەین!"
"بێگومان دەزانن چی دەکەن. من بە ڕێگای خۆمدا دەچم، ئێوەش بە ڕێگای خۆتاندا. لە کۆتاییدا بزانین کاممان دەگەینە مەنزل."
"مەنزڵەکە و ڕێگاکەی تۆ بێمێژووە، ناگات بە هیچ."
"نا، وا نییە. من لەسەر مێژووی ئێوە دەوەستم، سەیری ئایندە دەکەم. ئەوەی لە ئایندەدا دیارە، منم نەک ئێوە."
"زۆر باشە... دیارە زۆر بڕوات بە خۆتە. یەکتر دەبینینەوە. بەڵام ئەم جواب و غرووڕەت بیر نەچێت."
چۆن هاتبوون، ئاواش بەبێ سەلام و کەلام ڕۆیشتن. سالمی پەنجەشین بەباشی گوێی لە قسەکانیان گرتبوو. ڕووی کردە دۆستەکەی و پێی وت، "ئەمە سەرەتای شەڕەکەیە، دۆست. بەس باش جوابت دانەوە. ئەمانەی بینیتن، ئەمانە شاعیرەکانی ناو دیوەخان و مەجلیسەکانن. ئەمانە شاعیرانی دەربارن، نازانن شیعر چییە. لای ئەمانە تا ئێستاش شیعر

هەست و نەست و ئاخ و ناڵین و پیاهەڵدانە. لەمە زیاتر هیچ نازانن.“

(چەند خۆشە دوژمنەکەت وەک خۆت ژیر بێت.)

# (٥١)

**مەجلیسەکە گەرم بوو.**

میری شارەکە لە سەرەوە دانیشتبوو. لەمبەر و ئەوبەری هۆدەکەشەوە پیاوان بەڕیز دانیشتبوون. ئەمانیش بانگهێشتی ناو مەجلیسەکە کرابوون. میر فەقیانە سپییەکانی لە مەچەکە گەورەکانی ئالاندبوو، مشکییەکی گەورەش بەسەر سەریەوە. پیاوماقوڵان و بازرگانان و شاعیرەکانیش لەتەنیشت یەک، سینییەک میوە لە ناوەڕاستی هۆدەکە بوو، کەس دەستی بۆ نەدەبرد. لەناو هۆدەکەدا جگە لە قرچەقرچی تەزبیحەکانی دەستی میر، دەنگی هیچ نەدەبیسترا.

کتوپڕ یەکێک لە شاعیرەکانی دەربار لە خوارەوە، نزیک دەرگاکە، درزی خستە ناو بێدەنگییەکە و دەستی کرد بە شیعرخوێندنەوە بە شانوباڵی میر و میرنشینەکەدا هەڵی دا. میریش بسکەی سمێڵەکانی دەهات و لەژێر چاویشەوە سەیرێکی نالیی باڵداری دەکرد و ئەو ڕۆژەی بیر دەکەوتەوە، کە بە زەڕینی کەرەکەی خەوی لێ تێک چووبوو. شاعیرەکە لە پیاهەڵدان بوویەوە و بە جارێک هەموویان دەستیان کرد

بە ئافەرینکردنی. ئەوەی ئافەرینی لە شاعیرەکە نەکرد، تەنها نالیی باڵدار و سالمی پەنجەشین بوو.

میر سەرنجی چووە سەریان و بەخۆبادانیکەوە پرسیی، "ها... بەدڵتان نەبوو؟"

"نەخێر قوربان، بەدڵم نەبوو. ئەوە نە شاعیرە و نە ئیشی شیعریشە لە شوێنی وادا بوترێت."

"بۆ شاعیر نییە و بۆ ئیشی شیعر نییە؟ ئەمە نەریتێکە و هەزاران ساڵە هەیە. دیارە تۆ ئاگات لێ نییە."

"با قوربان، ئاگام لێیە. هەر ئەم نەریتە کۆنەیە وای کردووە ئەم خەڵکە تا دێت بەستەزمانتر بن."

میر تەنگەتاو بوو بە قسەکانی. چرپەچرپێک لەناو مەجلیسەکە دروست بوو. کەسیان تا ئیستا نەیوێرابوو بەم شێوەیە قسەی لەگەڵ بکات. دەیویست خۆی بگرێت و وا خۆی پیشان بدات قسەکان کاریان تێ نەکردووە، بەڵام نەخێر، باش کاریان تێ کردبوو. بۆیە زۆر بە شێوەیەکی ناخۆش وەڵامی دایەوە، "تۆ میرزایەکی ئەو دەوروبەرەی، هاتوویت بۆ شارەکەی ئێمە فێری شتمان بکەیت؟"

"نا قوربان، نەهاتووم فێری شتتان بکەم. هاتووم پێتان بڵێم زمانەکەی خۆتان عەیبی چییە، بۆ بە زمانی خۆتان نانووسن؟"

"ئەمە نەریتە و زمانی دیوەخان و مەجلیسی پیاوان جیاوازە. هەر دەبێت جیاواز بێت، خۆ قابیلە ناچین بە زمانی ئەو پەشۆڕووتە شاعیرەکانمان فێر بکەین بنووسن."

نالیی باڵدار زانیی میریان لێی پڕ کردووە. یەکەم جاریشی بوو بیبینێت. نەیویست زۆر ئازاری بدات و بیشکێنێتەوە،

بۆیە زۆر بەهێمنیەوە وتی، "خودا زمانی بە هەموو مرۆڤێک داوە. هەر دەستە و تاقمێک زمانی خۆیان هەیە، بۆیە زمانی خۆیانی پێ داون تا بەو زمانە بنووسن و بیر بکەنەوە و لە یەکتری تێبگەن. بیویستایە هەمووومان بە یەک زمان قسە بکەین، ئەم هەموو زمانەی دروست نەدەکرد."

میر هێمن بوویەوە. قسەکەی ئەو یەکێک بوو لە ئایەتەکانی ناو قورئان. نەیدەویست ڕەدی بکاتەوە. جوابی نەدایەوە و بێدەنگی هۆدەکەی داپۆشی.

(تەنانەت جوانییش دوژمنی هەیە.)

## (٥٢)

**نیوەڕۆکەی داوەت کران.**

جێگری میر گفتوگۆکەی بیستبوو، ناردبووی بەشوێنیاندا.

لەناو دیوەخانەکە دانیشتبوون. دیوەخانێکی گەورە بوو. جێگری میر خۆی لەمبەرەوە و ئەوانیش هەردووکیان لەوبەرەوە. لەناو سینییەکی مسینی نەخشێنراودا نانی نیوەڕۆیان بۆ هات و هەرسێکیان دەوری سینییەکەیان دا. جێگرەکەی میر پیاوێکی دونیادیدە و خوێندەوار بوو، هەمیشە سەرکۆنەی شاعیرەکانی دەرباری کۆشکی دەکرد، بەوەی واز لە پیاهەڵدان بهێنن و ئەدەب هیی ئەوە نییە لەپێناو بەدەستهێنانی ناندا بەکاری بهێنێت.

دوو تاڵ تەڕەپیاز و قاژێک توور و لەتەشفتەیەکی خستە ناو نانەکە و بردی بۆ دەمی. هێشتا بەباشی نەیجوییبوو، کەوتە قسەکردن، "ئێوە دوو دۆستی ئازیزن. من تازە نالیی باڵدار دەناسم و ئەزانم هەندێک خزمی تۆیە، سالمی پەنجەشین، تۆ یەکێکی لەو کەسانەی لەم شارەدا خانەوادەیەکی بەڕێزت هەیە. سەرت بۆ کەس شۆڕ نەکردووە و خەریکی ئیشی

خۆتی. ئەمەی ئێوە دەیکەن، ڕێگایەکی ئاسان نییە. ئێوە نازانن چ حەشەراتێک لە دەوروبەری میر و کۆشکەکەیەتی. ئەم نانخۆرانە هەر وا دەست هەڵناگرن و ڕێگا نادەن ئێوە نانەکەیان ببڕن. زۆری دەوێت تا بتوانن بەم شێوەیە بنووسن. نانەکەشیان لەسەر ئەو شێوازە زمان و نووسینەیە، کە کردوویانە بە پیشە بۆ پەیداکردنی نان. جا نامەوێت بتانترسێنم و ناشمەوێت ئامۆژگاریتان بکەم، بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم بۆچوونی میری گەورە بگۆڕم و نەهێڵم بەو شێوەیە بێت کە نانخۆرەکان دەیانەوێت. وای دانێن ئێوە دوو کەس نین و بوون بە سێ کەس."

سالمی پەنجەشین، زۆر سوپاسی کرد و خۆی وتەنی، "هەر چاوەڕێی ئەوەم لێ دەکردیت. پێشووتریش دوو-سێ جار ویستم بێین بۆ لات، ئەم دۆستەی من تۆزێک دوورنشینە، حەز ناکات زۆر تێکەڵ بێت. چوونیشمان بۆ مەجلیسەکە، ڕاستییەکەی، چوونێک نەبوو بەدڵی خۆمان بێت، بانگ کرابووین. خوا کردی زۆر بەخراپی جێمان نەهێشت. خۆشمان بەباشی بۆنی ئەو شەڕەمان کردووە. ئەرکەکەی من قورس نییە، هەر دەنووسمەوە، ئەرکی نالیی دۆستم قورسە. ئەو ئاگرەکەی داگیرساندووە و بەنیازیش نییە بهێڵێت بکوژێتەوە."

جێگرەکەی میر دڵنیایی پێ دان لەپشتیانە. هێندە بێزار بووبوو لەو سەبکە شیعر و زمانەی پێشوو، دەیویست بەتەواوەتی بێتە ناو شەڕەکەوە. هێنانیەوە بیری، کە دوو پاسەوانەکە ئەو ناردبوونی بۆ کڕینی دەستنووسەکان.

نیوەڕۆیەکی خۆش و پڕ لە ئومێدیان بردە سەر. لە ڕێگەی

گەڕانەوە باسی ئەوەیان کرد، کە خەڵکێک هەن هەمیشە پشتوپەنان. ئێستا پشتوپەنایان پەیدا کردووە و دەتوانن بە باشتر و گەرمتر دەست بدەنە کارەکە. نالیی باڵدار دەستی خستبوویە سەر ملی کەرەکەی و لەبەر خۆیەوە دەیوت، "ئەی پیاو، لەگەڵ کەرێک هاتی بۆ ئەم شارە، چونکە خەونی گەورەت پێ بوو، ئێستا بوویت بە جێی مەترسی بۆ خەونە بچووکەکان."

(تەنها عەشق هێندەی خەون گەورەیە.)

# (٥٣)

**لە دەرگا درا.**

کە دەرگاکەی کردەوە، دوو پاسەوانەکە بوون.

نامەیەکیان دایە دەستی و ڕۆیشتن. نامەکەی هێنا و لە بەردەم نالیی باڵداردا دای نا. ئەویش نامەکەی کردەوە. جێگری میر تێیدا نووسیبووی، *"ئەمڕۆ کۆمەڵێک شاعیری کۆن و شاعیری دەربار و کوێخاکان هاتبوونە لای میر بۆ شکاتت. شتی زۆر ناجۆریان دەگوت لەبارەتەوە. یەکێک بە بێگانەپەرست و یەکێک بە سووتێنەری مێژوو و یەکێک بە ئاژاوەچی باسیان دەکردی. هەریەکە شتێکی خراپی لەبارەتەوە دەوت. دیارە دەیانەوێت بوەستێت. تۆ نەوەستێت."*

نامەکە نیگەرانی کرد. لەو لایەشەوە کە جێگری میر نووسیبووی نەوەستێت، دڵی خۆش دەکرد. لە خۆی دەپرسی، ئاخر بۆچی ئەمانە دژمن؟ خۆ من شتێکی خراپم نەکردووە، تەنها ئەوەم کردووە کە پێویست بوو کەسێک بیکات. بۆچی ئەمانە هێندە ئازان بۆ شەڕکردن بۆ بێگانە و بۆ نایەن شەڕ بۆ خۆیان بکەن؟ لە مەجلیس و دیوەخانەکان شیعری

عەرەبی و فارسی بخوێنرێتەوە باشترە یان کوردی. ئەی هاوار، ئەمانە بۆ بەم جۆرە بیر دەکەنەوە.

ژنەکەی سالمی پەنجەشین خۆی کچەشێخ بوو. کاتی خۆی لە دیوەخانەکەی ماڵی باوکی گوێی لە زۆر شت بووبوو. کە لە مەبەستی نامەکە گەیشت، زۆر بەڕوخۆشییەوە دڵنەوایی دایەوە، "خەمت نەبێت، لە داستانە کۆنەکاندا بیستوومە، هەمیشە ئەوانە سەر دەکەون، بەعەشقەوە کارەکەی خۆیان دەکەن و کارەکەی خۆیان خۆش دەوێت. لە یەکەم ڕۆژەوە هاتوویتە ئەم ماڵە، ئەو عەشقەم لە چاوەکانتا دیوە. نیگەرانیی ناوێت، ڕۆژێک دێت سەر دەکەویت و هەر ئەوانەی ئەمڕۆ خەریکی پلانن بۆت، خۆیان دەکەن بە خاوەنی کارەکەت و تۆ بەغەریبییەوە سەیریان دەکەیت."

دوایی بیستیان کوێخاکان وتوویانە، "جەنابی میر، ئەم میرزادەیە کاتی خۆشی لەسەر خەونە باڵدارەکان ئاژاوەیەکی نایەوە. هەرجارێک ڕوو لەم شارە دەکات، شتێک لەگەڵ خۆی دەهێنێت نە بۆ نەریتی شارەکە باشە، نە بەکەڵکی سەردەمەکە دێت. ئێستا کارێکی کردووە خزمەتکارەکانمان گاڵتە بە شاعیرەکانمان دەکەن و بەپلارەوە پێیان دەڵێن، بۆ زمانی خۆتان شکاوە بە زمانی خۆتان نانووسن! دەبێت سنوورێک بۆ ئەم کابرایە دابنرێت و دیوەخانەکانمان نەبێتە شوێنی گاڵتەپێکردنی خزمەتکاران.

(دیوەخان و ئایین و خێڵ، گەورەترین بکوژی عەقڵن.)

هێشتا تازە ڕۆژ بووبوویەوە کە ئەم هەواڵەیان پێ گەیشت. هەردووکیان بەنیگەرانییەوە بەرەو بازاڕ ڕۆیشتن. بەس چاکوچۆنی و گەرموگوڕی خەڵکەکە نیگەرانییەکانیانی لەبیر بردنەوە.

# (٥٤)

**هەجووی سەر دەرگاکە.**

سالمی پەنجەشین ویستی دەرگای دوکانەکەی بکاتەوە.

بینیی لەسەر دەرگاکە تیانووسێک هەڵواسراوە، تیانووسەکەی لێکردەوە شیعرێکی هەجووی داشۆرینی تیا نووسرابوو. شیعرەکە بە شێوەیەکی گاڵتەجارانەی زۆر توند هێرشی کردبوویە سەر نالیی باڵدار. دیار بوو هەجوونووسەکە کەسێکە، پێشتر هیچی ئەمی نەخوێندووەتەوە و تەنها بۆیان باس کردووە. ئەویش بەبێ ئاگا کەوتبووە سەری و وەک قەلەڕەشێکی دەمەو ئێواران وەسفی کردبوو. قەلەڕەشێک ڕێگای لێ ون دەبێت و ڕوو دەکاتە شارێکی ڕووناک. لەو شارە ڕووناکەدا نازانێت چی بکات بۆ ئەوەی خۆی بناسێنێت، لەسەر دارتێلەکان خەریکی قیرەقیر دەبێت، تا منداڵان تێی بەر دەبن و لە شارەکە وەدەری دەنێن و دەڕوات.

پێکەوە سەرلەنوێ پارچە تیانووسەکەیان خوێندەوە. تاوێک پێکەنین بە هەجووەکە و نالیی باڵدار وتی، "ئەزانی سالمی

پەنجەشین، ئەم هەجوونووسە زۆر شیرینە، منی کردووە بە قەلەڕەش، نازانێت قەلەڕەش ژیرترین باڵندەی سەر زەوییە؟"

"جا فەقیرە بیزانیبایە، شتی وای نەدەکرد. بڕوا ناکەم لە ژیانیدا داستانێکیشی خوێندبێتەوە، خۆ سەیری داستانەکانی بکردایە دەیزانی قەلەڕەش چییە!"

"تۆ لەوە گەڕێ، پێدەچێت ئەمانە لە هەموو لایەکەوە دەستیان پێ کردبێت."

منیش وا هەست دەکەم. بەس جێگەی ترس نییە. ئەوەی هێرش دەکات، لە شوێنەکەی خۆی دەترسێت لەدەستی بدات، بۆیە هێرش دەکات."

"من خەمم نییە، خەمی تۆمە!"

"یانی چی خەمی منتە؟"

"خەمی ئەوەمە شەوێک ئەم کتێبخانەیەت بسووتێنن و ڕەنجەکەت بەبا بچێت!"

"نا مەترسە، ئەوەندە بێکەس نیم بوێرن دەست بۆ من ببەن. تۆ خەمی خۆت و کەرە بۆرکەت بێت. بیانەوێت دەست بوەشێنن، تۆیان دەست نەکەوێت، دەست بۆ کەرەکەت دەبەن."

"جا ئەو بەسەزمانە چی بکات!"

"ئیتر مرۆڤە دەبێت چاوەڕێی هەموو شتێکی لێ بکەیت. ئەمانە لەوەتەی هەن نان لەسەر ئەمە دەخۆن. تۆ سەرنجت نەداوە لەو ڕۆژەوەی لەسەر سەکۆکە شیعری تۆ دەخوێنرێتەوە، یەک شاعیریان نەهاتووە شیعر بخوێنێتەوە. بازاڕەکەیان بەرەو کزی دەچێت و لەناو خەڵکیشدا خەریکە پشتیان تێ دەکرێت، دەیانەوێت لە ڕێگەی میرەوە خۆیان

بسەپێنن. ئێمەش لەو دەوروبەرە پیاوێکی باش دەناسین."

"ئاخر من نامەوێت شەڕەکە بەو جۆرە بێت و ناشمەوێت بچمە ناو شەڕێکەوە ئەوان دوورستیان کردبێت."

"شەڕەکە ئەوان دروستیان نەکردووە، تۆ هەڵت گیرساندووە و ئەوان بە لاڕێیدا دەبەن."

"کە وایە، من دەبێت شەڕەکە بگەڕێنمەوە ئەو شوێنەی خۆم دەمەوێت."

"بێگومان وایە."

(مەچۆرە ناو شەڕی ئەوانی ترەوە، با بەدۆڕاوی نەیەیتە دەرەوە.)

# (٥٥)

**ئێوارەیەکی خۆش بوو.**

کۆمەڵێک خەڵکی ناو بازاڕەکە چوونە بەردەم کتێبخانەکە.

یەکێکیان، کە لە هەموویان بەتەمەنتر بوو، بەقاڵیش بوو، دەستەسڕێکی ئاوریشمی بەدەستەوە بوو، دەیهێنا بە ملە قەڵەوەکەیدا و ورگێکی گەورەی دەر پەڕاندبوو، بە دەنگێکی گڕەوە لەباتیی هەمووان دەستی کرد بە قسەکردن، "بەڕێز جەنابی شاعیر، نە من، نە ئەم خەڵکە، زۆر لە شیعر و میعر تێناگەین، هەر ئەوەندەش شیعرمان لا خۆشە، بێتە سەر زمانمان و لە گۆرانییەکدا گوێمان لێ بێت. درۆی ناوێت قوربان، نامانەوێت وا خۆمان پیشان بدەین ئاگاداری شیعرین. بەس بیستوومانە گەلەکۆمەت لێ دەکەن. خوا شاهیدە نە ئێشمان بە تۆیە، نە بەم دراوسێ بەڕێزەمان، کە چەندین ساڵە دراوسێمانە، ئەرکی دراوسێیەتیش جێبەجێ ناکەین، بەس لەبەرمان گرانە بە بەرچاومانەوە کەسێکی غەریبە گەلەکۆمەی لێ بکرێت و هەر وا دەستەوەستان دانیشین. ئا ئەمانەی لە دەوروبەری من دەیانبینیت، هەر هەمووی ئەهلی

ئەم بازاڕە و ئەهلی ئەم شارەن. ڕێک و ڕاست پێت دەڵێین، تۆ چی ئەمر دەکەیت، لە خزمەتتایـن."

نالیی باڵدار دەمی تەتەڵەی دەکرد، نەیدەزانی چی بڵێت، گەر بڵێت فڵان و فیسار گەلەکۆمەم لێ دەکەن، خۆ ئەمانە سەریان پێوە نییە و پەلاماریان دەدەن و ئازاریان دەدەن. زشتە شتی وا بڵێت، گەر بشڵێت، هیچ نییە و گوێی مەدەنێ، ڕەنگە ئەوان خراپتر بکەن. بەم حاڵەوە لە بەردەمیان وەستابوو، هیچی پێ نەدەوترا.

سالمی پەنجەشین زانیی دۆستەکەی نازانێت چۆن بیاندوێنێت، خۆی بە هەمان شێوازی خۆیان کەوتە قسەکردن لەگەڵیان، "بەڕاستی زۆر مەمنونی ئێوەین، کارێکتان کردووە، لە بەرچاومان ون نابێت. بێگومان پێویستمان بە یەکتری دەبێت. ئەم دۆستەی من گوناهێکی نەکردووە. ئەوەی خۆتان دەیبینن، ئەوەیە بەم زمانەی کە ئێستا قسەی پێ دەکەین، شیعر دەنووسێت، تاقمێکیش ئەمەیان پێ ناخۆشە و هەر ڕۆژی تەشقەڵەیەکی پێ دەکەن."

کە ئەم قسەیەی کرد، لەولاوە قەسابێکی سەروملقەوی کێردەکەی بەدەستەوە بوو، هەڵی دایە و وتی، "تەڵاقم کەوتبێت، تا ئێمە لەم بازاڕەداین، جگە لە شیعری ئەو، هەر شاعیرێکی دەربار، هەر شاعیرێکی تر بێت بەدەوری ئەو سەکۆیەدا، وەک مەڕەکان لە دوکانەکەم گۆشتەکەی دەفرۆشم."

سالمی پەنجەشین بەپێکەنینەوە ڕووی تێ کرد و جوابی دایەوە، "دراوسێی ئازیز، زۆر توند مەبە. بڕوا ناکەم جارێ خۆیان بێن بەم ناوەدا. ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئێستا ئەم

دۆستە غەریبەم هەست بە بێکەسی ناکات."

خەیلێک قسەیان کرد و هەریەکە ڕۆیشتەوە سەر کاروباری خۆی. دڵیان خۆش بوو خەڵکە سادەکە وردەوردە هاتووەتە پشتیان و لە هەمووشی خۆشتر، ئەم زمانە تازەیەیان پێ خۆشە بکرێت بە زمانی نووسین.

(کە بیرکردنەوەیەکی تازە هات، دۆستی بێت باشترە لە دوژمنی.)

# (٥٦)

**دەنگی بەقاڵەکان دەهات.**

ئـەم جـارە لەبریـی هاوارکـردن بـۆ سـەوزە، لەبریـی هاوارکردن بـۆ میـوەی تـازە، بەقاڵـەکان لەمسـەرەوە بـۆ ئەوسـەر پێکـەوە هاواریـان دەکرد، ئـەو شـیعرە تازانـەی نالیی باڵدار دەیاننووسـێت، لـە سـەوزەکەی ئێمـە جوانتـرە. ئـەو شیعرە تازانـە سفرەی دڵتـان ئاوەدان دەکاتـەوە، سـەوزەکەی ئێمـەش سفرەی ماڵەکانتـان. کڕیارە بەڕێزەکان، هیچی تێناچێت ئێوارەیـەک لەبریـی کڕینـی سـەوزە، بەیتێک شـیعر بکڕن. هیچی تێناچێت ئێوارەیـەک لەبریـی تێرکردنـی سکتان، ڕۆحتـان تێر بکـەن."

بـەم شـێوەیە بـە دەنگـی بـەرز لەپشـت سـەوزەکانیانەوە دانیشـتبوون و هاواریـان دەکرد. دەنگەکەیـان بازاڕەکـەی داگیر کردبـوو. کڕیـارەکان لەلایـان غەریـب بـوو، تـا ئێسـتا گوێیـان لـەوە نەبووبـوو بەقاڵێـک لەبریـی هـاواری سـەوزە و میـوە، هـاوار بـۆ شـیعر بـکات. بـە بۆنـەی ئەوانـەوە چەنـد کەسـێک هاتـن بـۆ دوکانـی کتێبخانەکـە و داوای دەسـتنووسـیان کـرد.

سالمی پەنجەشی، تەواو کەیفخۆش بوو. لەو بڕوایەدا نەبوو ڕۆژێک لە ڕۆژان خەڵکە سادەکەی ناو بازاڕ خەمی ئەدەب زیاتر بخۆن لەوانەی خۆیان بە ئەهلی ئەدەب دەزانن. زۆربەی ئەوانەی خۆیان بە ئەهلی ئەدەب دەزانن، ناخیان پڕە لە گرێ. گرێکانی ناخیان هیی خەونەکانی خۆیان نییە، هیی ئەوەیە کە دەبینن کەسێک لە ڕووی هوشیارییەوە پێشیان دەکەوێت و شتی باش و گەورە دەنووسێت، ئیدی ئەو گرێیەی ناخیان دەبێتە بزمارێک و ڕۆژانە دەچەقێتە دڵیانەوە. دوو-دوو و سێ-سێ یەک دەگرن و لەناو مەیخانە و چایخانەکان سەر دەکەن بەناو یەکدا، سەری زمان و بنی زمانیان باسی ئەو کەسانە دەکەن، کە لەوان باشترن. باسی ئەو کەسانە دەکەن لەناو خەڵکدا خۆشەویستن و شتەکانیان دەخوێنرێنەوە. بەس خەڵکە سادەکە هەرگیز ئەو گرێیەیان نییە کە ئەدیبەکان هەیانە.

هاواری بەقاڵەکان لە تەواوی شاردا دەنگی دایەوە.

هەندێک لەوانەی گوێیان لێ بووبوو، چیبان بیستبوو وەک خۆی بردبوویانەوە بۆ دیوەخانەکان و لەوێ لە بەردەم کوێخا و شاعیرەکانی دەربارەدا باسیان کردبوو. بەم دەنگوباسە زۆر نیگەران بووبوون. یەکێک لە کوێخاکان پێشنیازی خستبوویە بەردەمیان، پارە کۆ بکەنەوە و لە ناوبازاڕ بیدەن بە بەقاڵ و دوکاندارەکان، تا لەبریی ستاییشکردن، نەفرەتی لێ بکەن. هەڵسابوون کۆمەڵێک پارەیان هێنابوو بۆیان، ئەوانیش نەیانکردبوو بە نامەردی، دابوویانەوە بە ڕوویاندا و یەکێک لە قەسابەکانیش وتبووی، "ئێمە وەک شاعیرە دەربارەکان نیین خۆمان بفرۆشین، پێویستیشمان بە پارە

نییە و نامەردییش لەگەڵ غەریبەیەک و دراوسێیەکدا ناکەین. جارێکیی تریش بەم شێوەیە بێنەوە بازاڕ، بە منداڵە ورتکە لەم شارە وەدەرتان دەنێین."

بەدەستبەتاڵی ڕۆیشتبوونەوە. نالیی باڵدار و شیعرەکانی، تا دەهات، بەناو خەڵکدا بڵاو دەبوونەوە و ناوبانگی زیاتر دەبوو.

(کە ناوبانگ ڕووی تێ کردیت، تەنیاییش ڕووت تێدەکات.)

# (٥٧)

**ئەم جارە میریان هان دا.**

هەوڵەکانیان بۆ کڕینی دوکاندارانی ناو بازاڕ بێسوود بوو.

هەڵسان دەستەیەکی تۆکمەیان دروست کرد. دەستەکەیان سەرجەم کوێخا و خاوەن دیوەخانەکان و شاعیرە کۆن و دەربارەکان و مەلاکانی تێدا بوو. ئێوارەیەک خۆیان کرد بە کۆشکی میردا وماڵی میر پڕ بوو لە دەنگەدەنگ. بۆ نەگبەتی، ئەو ئێوارەیە جێگری میر لەوێ نەبوو. ئەوانیش بە کەیفی خۆیان، چی خراپ بوو، خستیانە سەر نالیی باڵدار. یەکێک لە مەلاکان بەیتەشیعرێکی هێنابوو بە عەقڵی خۆی بۆ میری تەفسیر کردبوو. تەفسیرکردنەکەی بە جۆرێک کردبوو، گوایە لەو شیعرەدا کوفری کردووە و ئەم کابرایە هەر دژی ئەدەبەکە نییە، دژی دینەکەشە و خەریکی بڵاوکردنەوەی کوفرە. یەکێکی تر لە شاعیرەکان باسی لەوە کردبوو، گوایە لەناو شیعرێکیدا یارەکەی خۆی کردوە بە خودا و دەیپەرستێت. کەسیش نازانێت یارەکەی

کتێبە و مەبەستەکەشی تەنها بۆ ئەوەیە خەڵک لە خودا دوور بخاتەوە.

ئەم باسانە میری نیگەران کرد.

بەبێ گەڕانەوە بۆ مەجلیسی شار و بۆ جێگرەکەی، داوای لە کۆمەڵێک پاسەوان کرد سبەی ڕێگە نەدەن دوکانی کتێبفرۆشەکە بکرێتەوە. بۆ سبەی کە دوکاندارەکان هاتن پاسەوانەکانیان بینی، زانییان شتێک ڕووی داوە. دوای پرسین، تێگەیشتن بە بڕیاری میر دوکانەکە ناکرێتەوە، ئەوانیش پەلاماری پاسەوانەکانیان دا و پێکدادان ڕووی دا. هەتا سالمی پەنجەشین و نالیی باڵدار هاتن، بازارەکە شێوا. گەر جێگری میر فریا نەکەوتبایە، دوور نەبوو خوێن بڕژێت.

دوایی کە جێگری میر بەباشی بۆ میری ڕوون کردبوویەوە شتەکان بەو جۆرە نین، هاتبوویەوە سەر خۆی، بەلام وتبووی، دەبێت ئەو دوکاندارانەی پەلاماری پاسەوانەکانیان داوە سزا بدرێن. هەرچۆنێک بێت، ئەمەشیان پینە کرد و ڕۆژەکە بە خێر گوزەشت.

زۆر بەخەمباری لە دوکانەکە پێکەوە دانیشتبوون.

نالیی باڵدار وتی، "دۆست، وا پێناچێت کارێکی ئەدەبی لە شارێکی ژەهراویی وەک ئەم شارەدا بە ڕێگای خۆیدا تێپەڕێت. ئەمانە تا دێت، نیازیان خراپتر دەبێت. باشترین ڕێگە بۆ من ئارامگرتنە. نابێت پەلە بکەم، دەبێت هاوکارم بێت لە ئارامگرتندا. ئێمە زۆر پەلەمان کرد."

سالمی پەنجەشین قسەکەی بە ڕاست زانی و بیری کردەوە لە پەلەکردنەکە هێمن ببنەوە، ترسیشیان هەبوو ئەو

کۆنەخوازانە لە کۆلانێکدا دوو هەرچیوپەرچییان بۆ بنێرن و ئازاریان بدەن.

(لەوە مەترسە شتێ ڕوو دەدات، لەوە بترسە ژیانێک بژیت هیچ ڕووداوێکی ترسناکی تیا نەبێت.)

## (٥٨)

**ڕەنگی منارە کۆنەکان.**

هەموو مەلاکان بە یەک جار لە دەمەوعەسرانێک، پاش نوێژ، دەستیان کرد بە خوتبەدان. خوتبەکەشیان کتوپڕ بوو. تەنها لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا مەلاکان بۆیان هەبوو لە دەمەوعەسراندا خوتبە بدەن، کەچی ڕووداوەکەیان هێندە بە دژی خۆیان وەر گرتبوو، ڕێک کەوتبوون لەسەر ئەوەی لە ڕێگەی زمانی ئایینییەوە هێرش بکەنە سەری و بیکەن بە نەفرەتلێکراوێکی خودا.

هەر مەلایە لە شوێنی خۆیەوە بەیتێک شیعری پەیدا کردبوو و گرتبووی بە دەستیەوە. شیعرەکەی خوێندبوویەوە و بە زمانە ئایینییە ئاگرینەکەی خۆیان دەستیان کردبوو بە لێکدانەوەی شیعرەکان. یەکیان هاواری کردبوو، بەم شیعرەی بەردەستما ئەتوانم بیسەلمێنم ئەو کابرایە پشتی لە دینە پیرۆزەکەمان کردووە و دەیەوێت بە شیعری کوفر شارەکەمان لە دین دوور بخاتەوە. کتوپڕ لەو کاتەدا جێگری میری گەورە لەناو خەڵکەکەدا بووبوو، کە گوێی لەم قسەیە

بووبوو، هەڵسابوویەوە و زۆر بەتوندی بەرسڤی مەلاکەی دابوویەوە. ئیتر کە خەڵکەکەی دیبووی ئەو بەو مەقام و دەسەلاتەوە بەرسڤی داوەتەوە و قسەکانی ڕەد کردووەتەوە، کردبوویان بە هەڵڵا و لەبریی ئەوەی مەجلیسی خوتبەکانی مەلاکان خەڵکەکە بگۆڕێت، ئەم هەڵڵایەی ناو ئەو مزگەوتە بوو بە حیکایەت و بەناو شاردا بڵاو بوویەوە.

خەڵکەکە تێگەیشتن جێگری میر لەپشت شاعیرە تازەکەوەیە، بەبێ ترس لایەنگریی خۆیان بۆ دەر خست و جارێکی تر هەوڵی دەستە کۆنەکە بە بەرژەوەندیی خۆیاندا نەشکایەوە.

دوکاندارە نوێژکەرەکان چیرۆکەکەیان بیستبوو، یەک-یەک دەهاتن بۆ دوکانەکە و دەیانگێڕایەوە.

نالیی باڵدار ئارامییەکەی خۆی تێک نەدەدا. ئەم جوولانە نیگەرانیان دەکرد، بەس لەبریی دەرخستنی نیگەرانییەکەی، بەردەوام بیری دەکردەوە شتێکی نوێ بنووسێت. گوێی لە هەموو لایەک دەگرت، ئیمانیشی هێندە بەهێز بوو، نەیدەویست دەنگی ئەو ئیمانەی ناخی بە شێوەیەکی ناجۆر بکاتە دەرەوە. گەیشتە بڕوایەک، شیعر یەکەمین وێستگەیە بۆ دەستکاریکردنی دونیا کۆنەکە بۆ دونیایەکی نوێ و یەکەمین دەرگاشە مرۆڤ ناخە شاراوەکەی خۆی لێوە بخاتە دەرەوە.

(هەمیشە ئازاردەرەکان بیر لە ئایندە ناکەنەوە.)

لەو کۆپلە کۆنانەی لەناو دەستنووسەکەی خۆی پاراستبوونی و لە سەردەمی تەنیاییدا نووسیبوونی، چەند دانەیەکیانی دایە دەستی دۆستەکەی تا بیاننووسێتەوە. ئەویش دەستی کرد بە نووسینەوەیان و کە تەواو بوو، لێی

وەر گرت. خۆی بە دەستی خۆی دەستنووسەکانی بەسەر دوکاندارەکاندا بەخشییەوە. ئەوانیش گەلێک خۆشحاڵ بوون بینییان بۆ یەکەم جارە شاعیرێک دەستنووسەکانی خۆی بەدیاری دەدات پێیان. زۆربەیان یەکسەر لەناو دوکانەکەیان هەڵیان واسی و بەشانازیپێکردنەوە لای کڕیارەکانیان باسی دیارییەکەیان دەکرد.

(تۆ دڵی مرۆڤێک خۆش بکە، دڵنیا بە دڵخۆشییەک دێتەوە سەر ڕێگای خۆت.)

## (٥٩)

**سوختەکان شێواندیان.**

پاش ئەوەی نالیی باڵدار بەدیاری شیعرەکانی لەناو بازاڕەکەدا بڵاو کردەوە، چەند دوکاندارێک، کە منداڵەکانیان سوختە بوون لەناو حوجرەکان، شیعرەکانیان بردبوویەوە ماڵ. ئەوانیش لەگەڵ خۆیان بردبوویان بۆ حوجرە. نیوەڕۆکەی، کاتێک لە دەرس تەواو دەبن، لەقەراخ حەوزەکە کۆ دەبنەوە و یەکێکیان هەڵدەستێتەوە و دەیەوێت وەک مامۆستاکەیان خوتبە بدات. بەیتەشیعرەکە دەر دەهێنێت و دەیخوێنێتەوە. شیعرەکە هێندە بە شیرینی و جوان نووسرابوو، ئەوانی تر داوایان کردبوو چەند جارێکی تر بیخوێنێتەوە. دوای خوێندنەوەی، یەکێک لە سوختەکان دەستی بەرز کردبووەوە داوای کردبوو ئەم دەنگی خۆشە، با بەئاوازەوە بیخوێنێتەوە و ئەوانیش بەشوێنیدا بیخوێننەوە. پێکەوە ڕازی بووبوون کارەکە بکەن. دەستیان کردبوو بە خوێندنەوە. هەمووان بە یەک دەنگ بەشوێن سوختە دەنگخۆشەکە خوێندبوویانەوە.

تومەز مەلای مزگەوتەکە لە هۆدەی فەقێکانی پشتەوەیە،

گوێی لە دەنگێکە، دەنگەکە زیاتر لە گۆرانی دەچێت، نەک قورئانخوێندن. یەکێک لە فەقێکان دەنێرێت بزانێت ئەو دەنگە چییە. ئەویش دەڕوات، دەگەڕێتەوە و بە مامۆستاکەی دەڵێت، "قوربان، سوختەکان بەیتەشیعرێکی نالیی باڵداریان هێناوەتە ناو مزگەوتەکە، یەکیان دەیخوێنێتەوە و ئەوانی تریش بەشوێنیدا."

کە مەلا گوێی لەمە دەبێت، چاوی سوور هەڵدەگەڕێت. دارێک دەگرێت بە دەستیەوە و بەرەو لای حەوزەکە دەچێت. هەر لە دوورەوە هاوار دەکات بەسەریاندا و بە دار بەر دەبێتە گیانیان. ئەو دەنگخۆشە دەگرێت، شەش-حەوت تووڵی باش دەکێشێت بە قاچوقولیا. ئینجا دەستنووسەکەی لێ وەر دەگرێت و فڕێی دەداتە ناو حەوزی ئاوەکەوە. سوختەکانیش بە ئازاری قاچوقولیانەوە بەحەپەساوی سەیری مامۆستاکەیان و دەستنووسی ناو حەوزەکە دەکەن.

دەستنووسەکە وردەوردە تەڕ دەبێت و مەرەکەبەکە خاو دەبێتەوە وشەکان دەکشێن و باوەش دەکەن بەیەکتریدا. وشەکان بە شێوەیەک بەرەو یەکتری دەچن و خاو دەبنەوە، بە چەند ساتێک سەرتاپایان لەناو یەکتریدا ون دەبن و دەبن بە یەک تۆپەڵ.

مامۆستاکەیان بە چاوە سوورەوەبووەکانیەوە، هەڕەشەیان لێ دەکات جارێکی تر دەستنووسی ئەو شاعیرە نەهێننە ناو مزگەوتەوە و پیان دەڵێت ئێرە شوێنی ئەو شیعرانە نییە.

سوختەکانیش لە ترسا ناوێرن هیچ بڵێن و تێشناگەن بۆچی مامۆستاکەیان بەو شێوەیە پەلاماری دان و لەو شیعرە تووڕە بوو. دوای ڕۆیشتنی مامۆستاکەیان، لە یەکتریان

دەپرسی، "بۆچی وای کرد؟" کەسیان وەڵامێکی لا نەبوو.
بەڵام تازە شیعرەکە هێندەیان وتبوویەوە، لەبەریان کردبوو. کاتێک دەڕۆیشتنەوە بۆ ماڵ، لە کۆڵانەکاندا پێکەوە دەیانوتەوە و ژن و کچانیش بە وتنەوەی شیعرەکە و ئاوازی دەنگی سوختەکان دڵخۆش دەبوون و پەنجەرەکانیان دەکردەوە و بەدەم زەردەخەنەوە گوێیان لێ دەگرتن.

# (٦٠)

**زووتر لە جاران.**

سالمی پەنجەشین زوتر لە جاران دەچووە دوکان.

ماوەیەک بوو بازاڕی نەمابوو. لەگەڵ پەیدابوونی دۆستە تازەکەی و هەڵڵای زمان و شیعرەکەی، بازاڕی بەرەو گرانەوە دەچوو. بەیانییان دوای نوێژ خۆی کۆ دەکردەوە و بەرەو دوکانەکەی دەڕۆیشت. لەو کەینوبەینەدا بیریشی لەوە کردەوە هۆدەکەی پشتەوەی ماڵی خۆیان چۆڵ بکات بۆ دۆستەکەی و چیتر عەزیەتی نەدات هەموو بەیانییەک لەگەڵ خۆی بیهێنێت، بەڵام کێشەی ئەوە بوو شوێنێک بۆ کەرەکەش دابین بکات، چونکە کەرەکە لە بەردەرگا دەبەسترایەوە و دراوسێکان لەبەر خاتری دراوسێیەتی قسەیان نەدەکرد، ئەگینا لەبەریان گران بوو. حەزیشی نەدەکرد بیهێنێتە حەوشەکە و دەیشیزانی نالیی باڵدار بەبێ کەرەکەی لە هیچ شوێنێک شەو ناکاتەوە. دەبایە هۆدەکەیەکی بچووکی بۆ چاک بکات.

جاری وا هەبوو تا دەهات دوو مشتەری لە چایخانەکەی

دەستەچەپ چاوەڕێیان دەکرد. ئەمیش زۆر بەتەماح نەبوو. لەو دەستنووسانەی دەیفرۆشت، شتێکی کەمی دەست کەوتایە ڕازی بوو. هەندێک جاریش تەنها بیری لەوە دەکردەوە ئیشی دۆستەکەی بڵاو ببێتەوە و خێریشی تیا نەبێت کێشە نییە، هەر بەشی مەرەکەب و تیانووسەکان و قامیشەکانی دەست بکەوێت ڕازی دەبێت.

شارەکە پێشووتر بەو شێوەیە ئەهلی شیعر و ئەدەب نەبوون. تەنها ئەوانەی خۆیان بە ئەهلی ئەدەب دەزانی، گرنگییان بە ئەدەب دەدا. کەچی ئێستا زۆر کەس دەخوێنێتەوە و دەستنووس دەکڕێت، کە پێشووتر لە ژیانیدا بۆی گرنگ نەبووە بخوێنێتەوە.

لەو هونەرە تێنەدەگەیشت بۆچی وا بەخێرایی خەڵکە سادەکە قبوڵیان کرد. خۆی لە ڕاستییشدا زمانەکەی وا ئاسان نەبوو هەموو کەس لێی تێبگات. شیعری هەبوو خۆی بەباشی ڕوونی نەکردایەتەوە، کەس لێی تێنەدەگەیشت، لێ ئاوازی وشەکان هێندە خۆش بوو، بەو لێتێنەگەیشتنەشەوە خەڵکەکە قبوڵیان بوو.

بازاڕکرانەوەکەی جۆشوخرۆشێکی زیاتری پێ بەخشی. زیاتر گرنگیی بە خەت و بە نیشکردن دەدا. وای لێ هاتبوو، ڕۆژی وا هەبوو هەشت-نۆ دەستنووسی دەفرۆشت. فرۆشتنی هەشت-نۆ دەستنووس شتێک بوو وەک خەیاڵ.

(کە کارێکی جوانت کرد دەستت مەگۆڕە، با بازاڕت نەکەوێت.)

بە خەتێکی کوفیی جوان ئەم دێڕەی نووسی و لە پشت سەری خۆی هەڵی واسی. کە کڕیارێک دەهات داوای

دەستنووسێکی دەکرد و ئەو دێڕەی دەخوێندەوە، سەیری دەکرد بزانێت خۆی کار بە قسەکەی پشتی سەری دەکات. کە دەیانبینی زۆر بەوردی و بەعەشقەوە بەیتەکەیان بۆ دەنووسێت، ئەوانیش بەدڵخۆشییەوە دەیانوت، "دەست و پەنجەت خۆش بێت، بەڕاستی بەعەشقەوە کارەکەی خۆت دەکەیت." ئەویش سەرێکی بۆ ڕادەوشاند و سوپاسگوزاریان دەبوو.

دەستنووسەکانماڵەوماڵ بڵاو بوونەوە. گەیشتن بە دیوەخان و مزگەوتەکان و ناو کۆشکی میر و خانەدانەکان. گەیشتنە ناو ماڵی شاعیرە دەربارەکان و شاعیرە کۆنەکان. گەیشتن بە جووتیار و پیشەگەران. لەناو بازاڕەکەدا کەم دوکان هەبوو پارچەشیعرێکی هەڵنەواسیبێت. سەکۆی شاعیرەکان چۆڵ بوو، هیچکەس نەدەهات شیعری خۆی بخوێنێتەوە. باس باسی زمانە نوێیەکە و شاعیرە نوێیەکە بوو. ئەویش بە خۆی و کەرێکەوە بەناو بازاڕ و کۆڵانەکاندا دەگەڕا و وەک هەورەبرووسکەیەک هەر ڕۆژی دەنگی پارچەشیعرێکی لە لایەکی شارەکە دەدا.

# (٦١)

**میر بەمۆنییەوە چاوەڕوان بوو.**

دوو پاسەوان نالیی باڵدار و کەرەکەیان هێنا بۆ حەوشە.

لە پەنجەرەوە سەیری دەکرد. مێزەرێکی کۆن بە سەریەوە، ریشێکی سپی و پرچێکی سپی. ڕەشووی کەرەکەی بە دەستیەوە و لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا وەستابوو. کەوا شینەکەی هێندە خۆر لێی دابوو، لە زۆر شوێنەوە سپی هەڵگەڕابوو. دەسماڵە سەوزەکەی کەمەریشی لە چەند شوێنێکەوە درابوو. تا زیاتر لێی ورد دەبوویەوە، هەژاریی جلوبەرگی زیاتر دەر دەکەوت. لەمدیوی پەنجەرەکەوە بە خۆی دەوت، "تۆ کێیت؟ تۆیەک بەم جلوبەرگە شڕەتەوە، بەم کەرەی دەستتەوە هاتوویت زمانێکی چەندساڵەت وێران کرد. تۆ کێیت بە ڕوخسار ئەوەندە هەژار و بە عەقڵ ئەوەندە گەورە؟ ئەبێت چی لەژێر ئەو مێزەرەی سەرتدا بێت؟ بۆ ئەوەندە ئارام و سادەیت؟"

لە دڵی خۆیدا سەرسام بوو پێی، ئەما نەیدەویست ئەو سەرسامبوونەی دەر بخات و دەیشیزانی تازە هیچ هێزێک

نییە بتوانێت بیوەستێنێت و ئیشی خۆی کردووە. لەبەر ڕیشە سپییەکەشی نەیدەتوانی بڕیار بدات لە شار دەری بکات، دەترسا دەرکردنەکەی ببێتە هۆی ئەوەی زیاتر ببێت بە حیکایەت و خەڵکەکە زۆرتر هۆگری ببن. بەدەست شکات و نیگەرانیی کوێخا و شاعیر و مەلاکانیشەوە بێزار بوو.

پەنجەرەکەی کردەوە و بە دەست بانگی کرد بۆ ژوورەوە.

ماوەیەکی زۆر دووبەدوو لە ژوورەوە بوون.

کە هاتە دەرەوە هەم ئەم ڕوخساری شێوابوو، هەم میر. کەسیش نەیزانی ئەو گفتوگۆیەیان چی بووە و بڕیاری چییان داوە. بە ڕوخساری هەردووکیشاندا دیار نەبوو کامیان سەر کەوتووە و کامیان سەر نەکەوتووە.

ڕەشووی کەرەکەی گرت و بەهێمنی لە حەوشەکە چووە دەرەوە. هەرچۆن سەرەتا هات لە پەنجەرەوە سەیری دەکرد، لە کاتی ڕۆیشتنیشدا بە هەمان شێوە. لەگەڵ خۆی تووشی دوودڵی هاتبوو. نەیدەزانی ئەم زمانە تازەیە قبوڵ بکات و خۆی بکات بە دوژمنی ئەدیبە کۆنەکان، یان ئەم زمانە بیووکێنێتەوە و کۆتایی بە کێشەکە بهێنێت. کە سەیری شیعرەکانیشی دەکرد بەو هەموو جوانی و ڕەوانییەوە نووسرابوون، یەکسەر دەنیشتنە سەر دڵی.

داوای لە خزمەتکارەکەی کرد جامێک ئاوی بۆ بهێنێت. جامە ئاوەکەی خواردەوە و بەرەو تاقی کتێبەکان ڕۆیشت. لەناو تاقەکەدا یەکێک لە بەیتەشیعرەکانی ئەوی دەر هێنا و چەندجارێک لەسەر یەک خوێندیەوە. بیری لەوە کردەوە بەهێمنی کێشەکە یەکلایی بکاتەوە، نەهێڵێت نە شیش بسووتێت، نە کەباب.

هەمان خزمەتکاری ڕاسپارد مەجلیسی شارەکە بانگ بکات ئێوارە لە کۆشک نان بخۆن. مەبەستەکەشی ئەوە بوو لەگەڵیان گفتوگۆ بکات و ڕێگەچارەیەکی باشی بۆ بدۆزنەوە. خەڵکی شارەکە بووبوون بە دوو بەشەوە، بەشی زمانە تازەکە و بەشی زمانە کۆنەکە. گەر لایەکی بگرتایە و لاکەی تری بەر بدایە، بۆی باش نەبوو. دەبایە مەجلیس شتێک بکات. وردەوردە گەیشتە ئەو باوەڕەی خۆی لەناو کێشەکە بهێنێتە دەرەوە و بیداتە دەست مەجلیسەکە. ئیدی بەرەو هەرلایەک چوو، بۆ ئەم زەرەری نییە. حەقی خۆی بوو، میر بوو، دەبایە هەر وا بیر لە میرنشین و دەسەڵاتەکەی بکاتەوە.

(دەسەڵاتپەرستان نە دوژمنیان هەیە، نە دۆست، لەو نێوانەدا بەرژوەندییان هەیە.)

# (٦٢)

**حوجرەی فەقێکان کەسێکی تری نەدەگرت.**

هەرچی مەلا و کوێخا و خاوەندیوەخان بوون، هاتبوون.

خەتیبی گەورە لە سەرەوە دانیشتبوو. نالیی باڵداریش لەتەنیشتی. لەسەر شەرەفی خەتیب دانیشتنەکە ڕێک خرابوو. سەرتاپای مەجلیسەکە پێکەنینێک، زەردەخەنەیەکی لێوە دەر نەدەهات. دوای قسەکردنی خەتیب، سەرەی نالیی باڵدار هات قسە بکات. ئەویش بەهێمنی دەستی کرد بە قسەکردن. لە قسەکانیدا باسی لەوە کرد، خودای گەورە زمانی جیاجیای دورست کردووە، پێویستە بەو زمانانە قسە بکرێت و بنووسرێت. هاتنی زمانێکی نوێ، لەچاڵنانی زمانە کۆنەکە نییە. بەڵکو گەشەکردنی زمانێکە و سوودبینینە لە زمانە کۆنەکە. پاشان باسی لەوە کرد، ئەم کەسێکی ئیماندارە، کەسێکە پێشتر لەم شارە و شوێنانی تر دەرسی خوێندووە و ئەهلی کتێب بووە. ڕاستە خەڵکی گوندێکی بچکۆلەی ناو دەشتاییەکانە، بەلام زمانانی تریش دەزانێت و ئاگای لە دەوروبەرە. سەرسامیی خۆشی دەر خست کە بۆچی بەو

شێوەیە دژی دەوەستنەوە و ئازاری دەدەن. ئیمانداربیەکەی خۆی ڕوون کردەوە، کە هەرگیز وەک ئەوە نییە ئەوان لێی دەخوازن.

کە قسەکانی ئەو تەواو بوو، ئیتر وەڵامدانەوە و پرسیارکردن دەستی پێ کرد. هەندێکیان پرسیاریان دەکرد و دەیانویست بیخەنە کونجێکەوە و تەنگەتاوی بکەن، ئەویش خۆی تێک نەدەدا و وەڵامی دەدانەوە. هەندێکیشیان ڕاستەوخۆ هێرشیان دەکردە سەری و بە ئاشووبی ناو شارەکە ناویان دەبرد.

هەرچۆن کاتی خۆی کتێبی *خەونە باڵدارەکانی* نووسی و ئازاریان دا. بە هەمان شێوە ئەم جارەش ڕووبەڕووی ئەو ئازارە بوویەوە. لێ چونکە ئەزموونی هەبوو و دەیزانی چی دەکا، بەرگەی دەگرت و بە شێوازەکەی خۆی ڕووبەڕوویان بوویەوە. بێڕەحمیی ئازاردەرەکان لەوە فراوانتر بوو بەم دانیشتنانە کۆتایی بێت و لێگەڕێن بەئاسوودەیی کارەکەی خۆی بکات. بەتەواوەتی ترسابوون و دڵنیا بوون ئەم زمانە نوێیە شەپۆلێکە هاتووە و ئەوەی کۆنە لەگەڵ خۆی دەیسڕێتەوە.

دانیشتنەکەیان درێژەی کێشا. پێناچێت لەوانەی لەوێ بوون، چوار کەسیان بڕوای گۆڕابێت. گەرچی نموونەی زۆری بۆ هێنانەوە و هەوڵی دا تێیان بگەیەنێت ئەمە بۆ ئەوان باشە، نەک خراپە. کەللەڕەقی و بەرگریکردنی ئەوان بە نەریتە کۆنەکەی خۆیان، هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات.

بە ماندووبوونێکی زۆرەوە بەرەو لای دۆستەکەی ڕۆیشت.

کە لەسەر کورسییە بچوکەکە دانیشت، داوای قومێک ئاوی کرد. قومە ئاوەکەی خواردەوە و بەخەمبارییەوە بە سالمی پەنجەشینی وت، "ئەمانە دەست لە ئازاردان هەڵناگرن. من زۆر نائومێدم بەم خەڵکە نەریتپارێزە. تەنانەت نایانەوێت مرۆڤ لەناو خەیاڵەکانیشیدا بیر لە فرین بکاتەوە."

کەمێک دڵنەوایی کرد و مژدەی ئەوەی پێ دا ڕۆژانە خەڵک زیاتر ڕوو لە شیعرەکانی دەکەن و هەندێک لە خوێندەواری ناو حوجرەکانیش داوایان کردووە دەستنووسیان بۆ بنووسم. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، بەم کارەی وردەوردە ئەم شارە لە ژەهرە کۆنەکە پاک دەکاتەوە و پێویستە دان بە خۆیدا بگرێت.

# (٦٣)

**بەقاڵەکان دەستیان کرد بە بانگەشە.**

سالمی پەنجەشین بەقاڵەکانی ئاگادار کردبوویەوە، سبەی ئێوارە نالیی باڵدار خۆی لەسەر سەکۆی شیعرخوێندەوەکە هەندێک قسە بۆ خەڵک دەکات و شیعرێکیش دەخوێنێتەوە. ئەم ئاگادارکردنەویە بەقاڵەکانی هێنایە جۆش و هەر لە ئێوارەی پێشووەوە دەستیان کرد بە هاوارکردن، کە سبەی ڕۆژی شاعیرە تازەکە دێت و با خەڵک بێن بۆ لای سەکۆی شیعرخوێندنەوەکە.

ئەوەی لە مەجلیسەکەدا زۆر ئازاری دا، یەک-دوو کەس باسی ئەوەیان کرد ئەم زمانە تازە نییە و پێشووتر لەناو داستانەکاندا بەکار هاتووە. دەیانویست هەوڵەکەی نەنرخێنن و وای لێ بکەن دەستی لێ هەڵگرێت. بە پێچەوانەی ویستی ئەوانەوە، غرووره جوانەکەی زیاتر دەبوو.

دەمەوئێوارە بوو، هاتە سەر سەکۆکە، خەڵکێکی زۆر لەدەوری سەکۆکە کۆ بووبوونەوە. بەم شێوەیە دەستی پێ کرد:

(ئەمە خۆ کوردی نییە، خۆکردییە.)

ڕێک مەبەستی ئەوانە بوو دەیانوسیت لە کارەکەی کەم بکەنەوە. بە کورتی و پوختی پێی وتن، ئەم زمانەی دروستم کردووە، خۆی هیی ئێوە نییە، خۆم دروستم کردووە. ئەوەی دەیەوێت بیکات بە هیی خۆی، با باش بزانێت تەنها من خاوەنیم، ئەوەشی نایەوێت ئەم زمانە قبوڵ بکات، با بۆخۆی لەناو زمانە بێگانە و کۆنەکاندا بمێنێتەوە و خەریکی جیهانەکەی خۆی بێت. کە شیعرەکەی خوێندەوە و دەستی کرد بە لێکدانەوەی شیعرەکە و باسی گەلەکۆمەکەکان و ئازاردانەکانی خۆی کرد، خەڵکەکە بەتەواوەتی پەریشان بوون. یەکێک لەناو خەڵکەکە هاواری کرد، "کێ ئازارت دەدا با ئێمە ئازاری بدەینەوە."

ئەویش بەم قسانە زۆر دڵتەنگ دەبوو، چونکە لە بنەوانەوە بۆ ئەوە نەهاتبوو ئازاری کەس بدات، بۆ ئەوە هاتبوو دەستکاریی دونیاکەیان بکات.

نزیکەی نیوکاتژمێر قسەی کرد و شیعری خوێندەوە. دوای تەواوبوونی، بە جارێک یەک چەپڵەی قایمیان بۆ لێدا. (دەمێک بوو شیعرێکی جوان نەمابوو تا چەپڵەی بۆ لێدرێت.)

بەناو خەڵکەکەدا هاتەوە بۆ دوکانەکە، گەنج و پیر، ژن و پیاو، یەک-یەک و دوو-دوو دەهاتنە لای و دەستخۆشییان لێ دەکرد. ئەم دەستخۆشییانەی ئەو خەڵکە سادەیە جێگای خۆشبەختی بوو بۆی. دەیشزانی لەپشتەوە دەسەڵاتدار و سێبەرەکانیان، خاوەنی دیوەخان و شایەرەکانیان، خەریکی نەخشەن بۆ ئازاردانی و ناهێڵن بەو ئاسانییە بە ڕێگاکەی خۆیدا تێپەڕێت.

(ئامانجی گەورە، بەبێ ئازار نایەتە دی.)

لەبەر خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە. باشە گەر من نەهاتمایەتە ئەم شارە، چی ڕووی دەدا؟ یان گەر بهاتما و وەک ئەوان هیچم نەکردایە، چی ڕووی دەدا؟ ئەم پرسیار و بیرکردنەوانەی لایەکی ژیانیان داگیر کردبوو. لە ناخیشیدا ڕووناکییەک هەبوو، ڕووناکییەکە نەیدەهێشت بۆ ساتێک ئارام بێت و بەردەوام شتی نوێی پێ دەنووسی.

## (٦٤)

**شاعیرەکان لەسەر سەکۆکە بوون.**

هێندە شاعیر هاتبوو، لەسەر سەکۆکە جێگایان نەدەبوو.

خەڵکێکی زۆریش کۆ ببووەوە. لەناو هەموویاندا شێوازی نالیی باڵدار جیا بوو. ئەوان سەروقژیان هاتبوو، ئەم قژی کورت کردبوووەوە و کەمێک ڕیشە سپییەکەی ڕێکوپێک کردبوو. ئەوان جلەکانیان جۆرێکی ڕەنگاوڕەنگ بوو، ئەم جلەکانی، گەرچی کۆن بوون، بەڵام تەنها ڕەنگی شینی کاڵ و ڕەنگی سپیی تێکەڵ کردبوو. لەناویاندا نوورانیتر، هێمنتر، دونیادیدەتر دەهاتە بەرچاو. زۆربەی خەڵکەکە بەچرپەوە لەگەڵ یەکتری قسەیان دەکرد و قەسەکانیان باسی جیاوازیی ئەوی دەکرد لەتەک شاعیرەکانی تر.

یەکێکیان، کە خۆیان پێیان دەوت شێخی شاعیران، سەرزلێکی ورگزل بوو. وا باسیان دەکرد لەوەتەی هەیە خزمەتکاری میر و دەسەڵاتدارەکان بووە. دیار بوو هێندە چێشتی بەلاشی خواردبوو، غەبغەبەی شۆڕ ببوویەوە. ئەم شێخەیان دەستی کرد بە قسەکردن و بەشی خۆی کە لێی

دەزانی، تانەی لە زمانە نوێیەکە دا. نالیی باڵداریش وەڵامی دایەوە، "زمانی نوێ یانی دونیابینینی نوێ. ئەو زمانەی ئەوان پێی دەنووسن، بەشی بیرکردنەوە ناکات. زمانێکە وەستاوە و نە دەتوانن تازەی بکەنەوە، نە دەتوانن گۆڕانکارییەکی تێدا بکەن. ئەمەی من زمانی نوێ نییە، زمانی خەڵکە و بیری پێ دەکەمەوە."

شێوە جوابدانەوە ژیرانەکەی نەک خەڵکەکە، بەشێک لە شاعیرەکانیشی سەرسام کرد. لەناویاندا یەک-دووانێکیان گەنج بوون، دڵیان پێوە بوو لایەنداریی بکەن و دەشترسان. بۆیە لەبەینی خۆیاندا بە زەردەخەنە و شادومانییەوە جوابەکانیان پێ خۆش بوو.

شاعیرەکان زۆریان وت و ئەمیش بەکورتی جوابی دانەوە. چەندیان کۆشا نەیانتوانی زەرڕەیەک لە هەنگاوەکەی خۆی پەشیوانی بکەنەوە. لەبریی هێنانەدواوەی، زیاتر بەرەو پێشیان دەبرد. خۆی لای ڕوون بوو بکەونە گفتوگۆوە، کەسیان لە قەرەی نایەت.

هەتا شاعیرە پیرەکان ماندوو بوون و قاچەکانیان توانای وەستانی نەما و لەسەر چۆک دانیشتن، قسەیان کرد. کۆتاییەکەشی دیسانەوە لە بەرژەوەندیی خۆیان نەبوو. بەناچاری لە کۆڕی سەر سەکۆکەش بە ویستێکی لاوازەوە گەڕانەوە و سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. شەرمیشیان لە خۆیان نەبوو، دوای ئەو هەموو تانە و تۆمەتە، هاتبوون بە گفتوگۆ لە بەرچاوی خەڵک پەشیوانی بکەنەوە.

(پایەی بیرکردنەوەکانی خۆتت ناسی، ئایینەدەی نەخشەکانیشت دەبینی.)

ماندوویان کرد. هەوڵی زۆریان دا لە کاتی قسەکاندا بە قسەی پووچەوە خەریکی بکەن، نەیهێشت بچێتە ئەو بابەی ئەوان دەیانویست. خۆی چیی مەبەست بوو، هەر ئەوەی وت.

## (٦٥)

**خەونی بینی.**

لە خەونیدا ژنێکی شۆخ هاتە خەونی.

ژنە شۆخەکە کڵاوزەڕێکی بە سەرەوە، ملێکی بەرز، لووتێکی باریکی ڕێک و دوو چاوی ڕەشی گەورە و بالایەکی بەرزی باریکە. ژنەکە لە بەردەم پەنجەرەیەکدا دانیشتبوو، چرایەک لە بەردەمی و تیانووسێک و قامیش و مەرەکەب، ڕووناکیی چراکە دەیدا لە ڕوخساری و هێندەی کە نوور لە ڕوخساری دەباری. کەمێک لە کراسەکەی بەرز ببوویەوە و پاوانە لە قاچیدا. قولاپەکانی قاچی پڕ ببوونەوە و سپی دەیانننواند. لە خەونەکەیدا بەتامەزرۆییەوە سەیری ژنەکەی دەکرد، کتوپڕ ژنەکە لایەکی بۆ کردەوە، بە لاکردنەوەی ڕاچڵەکی.

لە بەردەم هەیوانەکەی ماڵی سالمی پەنجەشێندا خەوتبوو. چاوی کردەوە، ئاسمانێکی پڕ لە ئەستێرە بەسەر سەریەوە، کزەیەکی خۆش دەهات و خۆی دەکرد بەژێر سووچی لێفە لوولکراوەکەی سەریدا. چەند سیسرکێک پێکەوە دەنگیان

دەهات. قیڕەی بۆقێکیش لە دوورەوە بێدەنگیی شەوەکەی قاژ دەکرد. لێفەکەی لا دا و هەڵسا تیانووسەکانی هێنا و دەستی کرد بە نووسینەوەی چامەیەک بۆ ژنەی ناو خەونەکەی.

(هاتە خەوم، بە چ ناز و عیتابێ.)

بەم شێوەیە دەستی کرد بە وەسفکردنی ژنە. بۆ بەیانی، دەستنووسی چامەکەی لە ڕێگەی دوکانی دۆستەکەیەوە بڵاو بوویەوە. هەرکەسێک دەیخوێندەوە، لە بەردەم چامەکەدا دۆش دادەما. پیاوان بەخیلییان بەو زمانە دەبرد ئاوا بە جوانی و ناسکی و پاراوی هاتووەتە گۆ بۆ دەرخستنی جوانیی ژنێک. ژنانیش بەخیلییان بەو ژنە دەبرد چووەتە خەونی.

چامەی ژنی ناو خەونەکە هەڵلایەکی لەگەڵ خۆی هێنا، نەریتپارێزەکان و مەلا پینەچییەکانی نەریت چاویان چووە تەوقی سەریان. چامەکەیان بە بێحەیایی چواند و پێیان قورس بوو میرزایەک تا دوێنێ سوختە و فەقێی ناو خانەقاکان بووە، ئەمڕۆ یاخی بووە و لەپشت ئیمانەکەیەوە خەریکی پیاهەڵدانە بە لەشولاری ژناندا. ئەوانەشی بۆ جوانی دەگەڕان، تێریان لە خوێندنەوەی چامەکە نەدەخوارد.

سالمی پەنجەشین، کە تا ئەو ساتەش هیچ شتێکی نەنووسیبوو و هەر خەریکی بنووسی بوو، ئەم چامەیە گڕی تێ بەر دا. بە جۆرێک شڵەژا و جۆشوخرۆشی تێ کەوت، خۆی وتەنی، "بانگی ڕاستی بەئاشکرا خۆشە." حەزی دەکرد دەست بکات بە نووسین و ببێتە سێبەری دۆستە باڵدارەکەی.

ئێواران، یان بەیانییان، کاتێ نالیی باڵدار بە کۆڵانەکاندا تێدەپەڕی، ژن و کچانی شۆخ پەنجەرە شینەکانی ماڵەکانیان دەکردەوە و پەنجەیان بۆ ڕادەکێشا و دەیانگوت، "ئەوە ئەو

شاعیرەیە کە جوانیی ژن دەناسێت."

تەنانەت میری گەورەی میرنشینەکە، کە چامەکەی خوێندبوویەوە، بەبێ ئەوەی شەرم بکات لە بەردەم شاعیر و کوێخا و دیوەخانشینەکاندا وتبووی، "تەح... لە ژیانمدا شتی وا جوانم نەخوێندووەتەوە. ئەم ماڵخرابە هەر بە نیشاندانی جوانییەکان، هەمووومان فریو دەدات."

# (٦٦)

**برینە کۆنەکە کولایەوە.**

بە گەنجی، یانی سەردەمی فەقیەتی، لە گوندەکەی خۆیان مەیلی بە کچێکەوە بووبوو. ئەو کچە ڕەشتاڵەیەکی ناوقەدباریک، قژێکی ڕەش و دوو چاوی تەڕی ڕەش، یەکێک لە چاوەکانی تۆزێک تیل بوو، ئەما ئەم تیلبوونە بووبوو بە نەخشێک بەسەر ڕوخسارییەوە. ددانە سپییەکانی لەژێر لێوە ئەستوورەکانییەوە بەڕیز وەستابوون، لە تەزبیحی سپیی سەر ملی مەرقەدەکەی عارفە گەورەکە دەچوون. کاتێ فەقێ بوو، بۆ ئیجازە دەگەڕایەوە ماڵ، ئەو ماوەیەی لە گوند دەبوو، هەموو گیانی دەبوو بە چاو بۆ سەیرکردنی کچەی ئەسمەر.

باوکی کچە جووتیار بوو، خانووە قوڕەکەشیان کەوتبووە خوار گوندەکەوە، کەمێک نزیک لە کانیی ژنان. ماڵی نالیی باڵداریش لەسەر تەپۆڵکەکە بوو، لە بەردەم هەیوانەکەوە دەیڕوانییە سەر کانییەکە. هەر بە ڕۆیشتنی کچەدا لە دوورەوە دەیزانی کە ئەوە. کاتێک ئەو دەچوو بۆ سەر کانییەکە، ئەمیش وەک چۆلەکەیەکی تینوو دەفڕی و لەنزیک کانییەکەوە

دەنیشتەوە.

هەتا فەقێیەتیی تەواو کرد، چوونەوەکانی بۆ ماڵ لەم حاڵەدا بوو. کە کتێبی *خەونە باڵدارەکانی* نووسی و ئازاریان دا و گۆشەگیریی هەڵبژارد، ماوەیەکی زۆر هەوڵی دا کچەی لەبیر بچێتەوە.

(یەکەمین خۆشەویست، یەکەمین برینە، تا مردن لە سینەدا دەمێنێتەوە.)

هەوڵەکانی سوودی نەبوو. جارجارە تارماییەکەی دەهاتەوە خەیاڵی. دوای خەونی بە ژنە نازدارەکەوە و نووسینی چامەکە بۆی، ئەم جارە برینە کۆنەکە بەتەواوەتی سەری هەڵدایەوە. هەر ئەو وێنە کۆنانەی لە خەیاڵیدا مابوونەوە، دەیکردن بە وشە و سەرلەنوێ وێنەی لێ دروست دەکردنەوە و بڵاو دەبوونەوە. برینی خۆشەویستییە کۆنەکەی کردی بە چرایەک بۆ کوڕان و کچانی شار. ئەو چیی دەنووسی لەو بارەیەوە، ئەوانیش لەبەریان دەکرد و لە جێژوانەکانیاندا بە یەکتریان دەوتەوە.

کەسانێک پێشتر کچەیان دیبوو، تانەیان لە شیعرەکانی دابوو، بەوە گوانهباریان کردبوو، ئاستی شاعیرەکە بۆ بینینی جوانی لاوازە و دەیەوێت کەسێکی زشت جوان بکات. ئەم تانەلێدانەی بەشێک بوو لەو شەڕەی لەگەڵیان هەڵیان گیرساندبوو. هەموو ئەو قسە ناخۆشانەی دەیاندایە پاڵی و خەنجەریان لێ دەدا وەک ئەم قسەیەیان ئازاری پێ نەدەگەیاند، چونکە ئەوان دەستیان بۆ شوێنێکی بردبوو، شوێنەکە خۆی برین بوو. بۆیە کە قسەکەی بیست، شەوەکەی خەوی لێ نەکەوت، تا شیعرێکی نووسی. لە شیعرەکەدا باسی جوانیی

تیلیی چاوی کچە ئەسمەرەکەی کردبوو، باسی لەوەش کردبوو ئەوە چاوی خەڵکە جوانی نابینێت، ئەوە چاوی ئەوانەیە ناتوانن جوانی وەک خۆی ببین، نەک تیلیی چاوی کچە ئەسمەرەکە.

شیعرەکەی تەرخان کردبوو، بۆ دۆزینەوەی زشتی لە چاوی نەیارەکانی و پیشاندانی چاوی کچە ئەسمەرەکە وەک خۆی. دیسانەوە ئەم شیعرەشی بوو بە باسوخواستی ناو خەڵک و دیوەخانەکان، تەنانەت میری گەورە لە مەجلیسێکدا بە شاعیرەکانی وتبوو، "قورتان بە سەر، ئەو خێل و خیچێک دەکا بە حۆریی لۆقا و چاوی ئێوە خێل و خیچ دەکا، جا ئێوە بەم کلۆڵییەی خۆتانەوە چۆن دەرەقەتی دێن. دەی فەرموون بە شیعر جوابی بدەنەوە، بزانم چیی لی دەکەن."

(خێل و قیچە... یان تەرازوی نازی نەختێک سەر دەکا.)

## (٦٧)

**برینەکانی گەورە دەبوون.**

لە لایەک برینی کچە ئەسمەرەکە، لە لایەک برینی دووریی لە دایک و باوکی، لە لایەک برینی قسەی خراپ و تۆمەتەکانی نەیارەکانی. لە لایەک برینی بێشوێنی و سەرباربوونی بەسەر دۆستەکەیەوە، لە لایەک خەمە گەورەکەی، خەمی زمان و دونیا و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ شاعیرە گەورەکانی میرنیشیەکانی دیکە. ئەمانە هەمووی بووبوون بە کەوایەکی شینی کاڵ و بەسەر شانیەوە بوون.

خەوی کەم بووبوویەوە، فێریش بووبوو جارجارە سیغاری دەکێشا. خەیاڵ و بیرکردنەوەکانی نەیاندەهێشت ئارام بگرێت. هەتا زیاتر شتی دەبینی، زیاتر خەیاڵ و بیرکردنەوەی تەنگیان پێ هەڵدەچنی. هەتا زیاتر ئازاریان دەدا، زیاتر ئیشی لە جوانیدا دەکرد. کەس وەک ئەو مرۆڤی سەردەمەکەی خۆی و ئایندە نەبوو، لەناو ئەو هەموو ناشیرینییەدا، لەناو ئەو هەموو تیرەدا کە تێیان دەگرت، بەشوێن جوانیدا دەگەڕا. کەم بوون کەسانێک بەو شێوازە

سەیری ژیان بکەن.

(ئەوەی لەناو ناشیرنییەکاندا بۆ جوانی بگەڕێت، دەتوانێت بفڕێت.)

ئێستا کە لەناو شاردایە، زیاتر لەو کاتەی لە کێوەکان بوو هەستی بە تەنیایی و بێکەسی دەکرد. تەنیاییەک دوور بێت لە مرۆڤ، تەنیایی نییە. تەنیایی ڕاستەقینە کاتێک دەست پێ دەکات، کە نزیک بێت لە مرۆڤ و هەست بە تەنیابوونی خۆت بکەیت. لەوەش قورستر، هەستی بێکەسییە. تەنیایی چەند سەخت بێت، هەرگیز هێندەی هەستکردن بە بێکەسی سەخت نییە. ئەم هەستەی بە بێکەسی، هەستێک نەبوو ماندووبوون و چاکەی سالمی پەنجەشین و کچە شێخەکەی ژنی لەبیر بکات. هەستێک بوو لەو ڕۆژەوە بۆی دروست بوو، دەیویست ژیان بە جوانتر ڕەنگ بکات، کەچی زۆر کەس ئەم جوانییەی ژیانیان نەدەویست.

شەوێک درەنگ خەبەری بوویەوە، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، کەسی لەدەور نەبوو. دۆستەکەی و کچە شێخەکەی ژنی لە هۆدەکەی خۆیان خەوتبوون. سەیرێکی دەرگای حەوشەکەی کرد کرابوویەوە، کەرەکەی قیت و قنج بە پێوە وەستابوو، لە دەرگاکەوە سەیری ئەمی دەکرد. چوو بۆ لای و دەستێکی هێنا بە لاملیدا و گوێکانی ڕاوەشاند و بەخەمبارییەوە قسەی بۆ دەکرد. گەر یەکێک بەو ناوەدا تێپەڕیبایە، دەیگوت ئەم پیاوە شێتە.

ئەوەندە هەستی بە تەنیایی و بێکەسبوون دەکرد، تەنانەت نەیدەتوانی سینەی بۆ دۆستەکەشی بکاتەوە و باسی ئەو هەستکردنە بکات. ناچار شتێکی دەچرپان بە گوێی کەرە

بۆرەکەیدا و هەمیشەش دووپاتی دەکردەوە، تۆ هاوسەفەری منی تا کاتی مردنم.

بۆ چارەسەرکردنی دەردی هەستکردنەکە، هەڵسا ئەو هەستەی کرد بە شیعر و چامە و بەیت و یەک لەدوای یەک بەناو شاردا بڵاوی کردنەوە و لە ڕێگای فەقێ و سوختەکانیشەوە شیعرەکانی گەیشتنە خانەقا و مزگەوت و سەکۆی شاعیرانی میرنشینەکانی تر و زمانە نوێیەکەی بووە جێگای قسەلەسەرکردن لای میرنشینەکانی دیکەش.

# (٦٨)

**کتوپڕ خەونە کۆنەکەی بینییەوە.**

لە خەونیدا لەناو هەمان دارستاندا بوو، نیوەی دارستانەکە سووتابوو. مرۆڤەکان شەڕیان دەکرد و خوێن ڕژابوو. دیسانەوە دوو دەنگەکەی ناخی بانگیان دەکردەوە. دەنگێکیان بانگی دەکرد بۆ ناو بەشی سەوزایی دارستانەکە و دەنگێکی تریشیان بانگی دەکرد بۆ ناو دارستانە سووتاوەکە. لەو بەینەدا دەنگی دارستانە سەوزەکە، بەگلەییەوە پێی وت، "تۆش... تۆش هەی باڵدار، تۆ لە ئێمە بوویت، تۆ باڵت هەبوو بۆ فڕین، تۆ دەنگت لە دەنگی باڵندەکان دەچێت، ڕۆحت لە ڕۆحی ئاسکە کێوییەکان، چاوت لە چاوی بازەکان. بۆچی پشتت لە ئێمە کرد. تۆش... تۆش ئەی باڵدار، بۆچی لەناو ئەم هەموو جوانییەدا بارگەوبنەی خۆت پێچایەوە و بەرەو بەشە سووتاوەکە ڕۆیشتی."

هێشتا ئەو دەنگە تەواو نەبووبوو، دەنگەکەی تر هاواری کرد بەسەریدا. باشت کرد، تۆ نە باڵت هەیە، نە دەفڕیت، تۆ مرۆڤیت و دەبێت لەناو مرۆڤدا بیت. ئەزانم ئازاری نزیکی

لە مرۆڤەکان لە هەموو ئازارێک بەسوێترە، بەڵام ژیان بەبێ ئەو ئازارە تامی نییە. باشت کرد هاتیت بۆ ناو ئێمە. تۆ چی دەکەیت لەناو ئەو بێزمانانەدا، ئیشی تۆ ئەوەیە نزیک بیت لە ئێمە. دەبایە زووتر بێیت و زووتر دەست لەو خەیاڵانە هەڵگریت.

ئازارێک لە سینەیەوە بەرز بوویەوە. ئازارێک، کە ئازاری خۆی بوو، ئازارێک بوو لەنێوان هەردوو دەنگەکەدا دەهاتە دەرەوە. هێندە ئازارەکەی بەتین بوو، لە خەوەکەی ڕاچڵەکی. بەو فێنکییە چینێک ئارەقەی کردبوو. ئارەقەکەی سڕی و لە گۆزەکەی تەنیشتی قومێک ئاوی خواردەوە. تێگەیشت بەشی دارستانە سووتاوەکەی ناو خەونە کۆنەکەی، ئەم شارە بووە کە هاتووە بۆ ناوی. ئەو بەشەشی کە سەوز و جوان بووە، ئەو ژیانەی خۆی بووە کە تێیدا ژیاوە.

پەشیمان نەبوو. پەشیماننەبوونەکەشی یەک هۆکاری هەبوو، لە بیرکردنەوەی خۆیدا وا لێکی دابوویەوە، گەر نەتوانێت ئەو بەشە سووتاوەی دارستانەکە چاک بکاتەوە، لانی کەم لە ڕێگەی زمانییەوە دەتوانێت بەو بەشە سووتاوە بڵێت، "سەیری ئەوبەر بکەن چەند سەوز و جوانە."

دوای ماوەیەکی زۆر بۆی ڕوون بوویەوە خەونە کۆنەکەی چ مانایەکی هەیە. بیریشی لەوە کردەوە خەونەکەی تری لەوانەیە لە شوێنێکی دیکە ببینێت و مانای ئەویشی بۆ ڕوون ببێتەوە.

پاڵی دابووەوە بە سەرینەکەیەوە و چووبوویە خەیاڵەوە. کچەی شێخی ژنی دۆستەکەی هاتە دەرەوە و بینیی بەخەبەرە، هات بۆ لای.

پێکەوە باسی زۆر شتیان کرد. کچە شێخ چیرۆکی خۆشەویستیی خۆی و سالمی پەنجەشینی بۆ گێڕایەوە، کە چۆن سالم کوڕی یەکێک لە خانەدان و داراکان بووە و بەناو کۆڵانەکەیاندا هاتووە و ئەمیش پەنجەرە شینەکەی ماڵیانی کردووەتەوە و سەیری یەکتریان کردووە. چۆن موریدەکانی باوکی بەچاوەوە بوون کە کچە شێخەکە دڵداری دەکات و ئەستەغفروڵلایان کردووە و ئەمیش بەپێکەنینەوە گوێی نەداونەتێ. بەشێکی زۆری چیرۆکەکەی خۆیانی بۆ باس کرد، تا ئەستێرەی بەیانی دەر هات و کەڵەشێر خوێندی. ئیتر دەستیان کرد بە ئاگرکردنەوە و چالێنان، تا سالمی پەنجەشینیش لە خەو هەڵسا.

(ئەو شەوانەی دوو کەس چیرۆکی خۆشەویستی دەگێڕنەوە، زەوی ئارامترە.)

## (٦٩)

**دەنگی هەواڵەکە گریاندی.**

بێتاقەت بوو. بەیانییەکەی ئیجازەی خواست لێگەڕێن بەتەنیا بێت.

لەشار چوویە دەرەوە. توولەڕێیەکی گرت و خۆی و کەرەکەی بە توولەڕێگەکەدا، بەناو کێڵگەکاندا کەوتنە ڕێ. ڕۆیشتن ڕۆیشتن، تا گەیشتنە لای کوخێک. کوخەکە دووکەڵێکی لێ بەرز دەبوویەوە. لە کوخە نزیک بوونەوە، پیاوێک لە بەردەم دەرگاکەی دانیشتبوو. سڵاوی لە پیاوە کرد و ئەویش هەڵسا و بەخێرهاتنی کرد. پرسیاری لێ کرد لەم شێونە چۆڵەوانییەدا چی دەکات؟ پیاوە بەخەمگینییەوە دەستی ڕاکێشا بۆ بنارەکەی ئەوبەر. لەوبەرەوە بنارێک دیار بوو، لە ناوەڕاستی بنارەکەدا ڕێگایەکیش. پاشان پیاوە وتی، "ڕۆژگارێک من ئا لەوێوە تێدەپەڕیم، سەرقافڵە بووم. ئەو ڕێگایە ڕێگای ئاوریشمە، لەوێوەوە دەچێت بۆ میرنشینەکان و شارە گەورەکانی تر. لەم شارەی کە تۆی لێ هاتی، من یەکێک بووم لە خانەدان و خاوەن بڕواکانی شار. لە

قافڵەیەکدا کە هەموو سەروەت و سامانەکەم پێ بوو، تووشی چەتە بووین. چەتەکان ڕووتیان کردمەوە و بە دەستی بەتاڵ گەڕامەوە. کاتێک خەڵکی شارەکە زانییان گیرفانەکانم بەتاڵ بوونەتەوە، ئیتر بەو چاوە سەیریان نەکردم کە جاران سەیریان دەکردم.

(خەڵکی ئەم سەردەمە بە گیرفانەکاندا مرۆڤەکان دەپێون.)

هەوڵی زۆرم دا خۆم بهێنمەوە مایە، هەوڵەکانم ئامانجیان نەبوو. خەڵکی شارەکەش بە جۆرێک پشتیان تێ کردم، پشتتێکردنەکەی ئەوان ئازاری زیاتر بوو لە ڕۆیشتنی سەروەت و سامانەکەم. ئەو کاتە سەرم دای لە بەردەکە و تێگەیشتم ئەوانەی دوێنێ وام دەزانی دۆستمن، دۆستی من نەبوون، دۆستی گیرفانەکانم بوون."

گوێی لە پیاوە گرت و هیچی نەوت. لە دڵی خۆیدا دەستخۆشیی لێ کرد بڕیاری داوە لەو شارە نەژێت و دوور بکەوێتەوە. نزیکەی عەسر بوو گەڕایەوە بۆ شار. خۆی کرد بە دوکانەکەدا و بینیی دۆستەکەی بە ڕووخۆشی یەکەوە چاوەڕوانی دەکات. هەر کە بینیی، هەڵسایە سەر پێ و پێی وت، "ئەمڕۆ شتێکی زۆر جوانت پیشان دەدەم." ئەمیش خۆی خەمگین بوو، گوێی نەدایە و چیرۆکی پیاوەکە ئازاری دابوو.

لەناکاو کتێبێک خرایە بەردەستی. کە ورد بوویەوە لە کتێبەکە، لە سەری سەرەوە نووسرابوو (دیوانی) لە ناوەڕاستی کتێبەکەشدا نووسرابوو (نالیی باڵدار) لە خواریشەوە نووسرابوو، بە قەڵەمی (سالمی پەنجەشین). کە ئەمەی بینی، یەکسەر فرمێسک لە چاویەوە هاتە خوارەوە و دەستی کردە ملی سالمی پەنجەشین.

تومەس لەو ڕۆژەوەی شیعری پێ دەدات بیاننووسێتەوە، دانەیەکی تایبەتی نووسیوە و شاردوویەتیەوە و بەبێ ئەوەی ئەم بزانێت، لەسەر یەک دای ناون و کردوونی بە دیوانێکی خنجیلانەی جوان. لە تیانووسی یەکەمیشدا بە خەتێکی کوفیی گەورە نووسرابوو:

(ئیتر من ساحیبی دیوانم.)

# (٧٠)

**چەند دانەیەکی لێ نووسرایەوە.**

سالمی پەنجەشین شەو و ڕۆژی خستە سەر یەک و خەریکی نووسینەوەی دیوانەکە بوو. کەس وەک ئەو سەرسام نەبوو پێی. تەنانەت بووبوو بە سێبەری دیوانەکە و بەئاگا و بەبێ ئاگا لەبەر خۆیەوە شیعرەکانی دەوت و جاربەجارەش بەبێ ئەوەی کەس بزانێت، خۆیشی بەیتێکی دەنووسی و شەرمی لە خۆی دەکرد پیشانی بدات یان بڵاویان بکاتەوە، خۆی دڵنیا بوو لەوەی ئیحای بەیتەکانی ئیحای هەمان شیعرەکانی ناو دیوانەکەی ئەون.

دانەیەکی نارد بۆ میری گەورە، دانەیەکیش بۆ جێگرەکەی و چەند دانەیەکی تریشی فرۆشت بەو خانەدانانەی هەر لە سەرەتاوە شەیدای شیعرەکانی بوون. لەناو بازاڕدا سوێندی خواردبوو، هەر چۆن لەناو تاقی هەموو ماڵێکی فارسەکاندا دیوانێکی حافز هەیە، دەبێت لەناو تاقی هەموو ماڵە کوردێکیشدا دیوانێکی نالیی باڵدار هەبێت.

ئەم قسەیەی پەنجەشین دەماودەم ڕۆیشت و گەیشتە

ناو دیوەخانەکان. کۆمەڵێک لە کوێخا و مەلاکان وتبوویان، "ئەگەر کوڕی یەکێک لە بنەماڵە گەورەکانی شار نەبووایە، حەقی ئەوەی هەبوو لەسەر ئەو قسەیەی لەم شارە وەدەر بنرێت."

دوای بڵاوبوونەوەی دیوانەکەی، دیوەخانشینەکان هێندەی تر شێت بوون. زۆر بێرەحمانە دەستیان دایە قسەپێوتنی. لە هەموو شوێنێک قسەیان پێ دەوت، گاڵتەیان بە زمانەکەی، بە شیعرەکانی دەکرد. بەچڕی کاریان دەکرد بۆ ئەوەی دیوانەکەی لە بەرچاوی خەڵک بخەن. ئاخر لەو کاتەدا قورس بوو شاعیرێک هەر وا بەئاسانی ببێتە خاوەنی دیوان.

ئەم جارە شکاتیان نەبردە لای میری گەورە، ئەم جارە خۆیان لە شوێنە قەرەباڵغەکان باسیان دەکرد و بێشەرمانە زمانیان بەر دابوویە گیانی ئەو باڵدارە. بە کۆمەڵێک هەرچیوپەرچیی ناو شارەکەشیان وتبوو، گەر دیوانەکان بدزن و بیسووتێنن، پارەیان دەدەنێ. ئەوانیش شەوێک چووبوونە سەر ماڵی یەکێک لە خانەدانەکان و دیوانێکیان دزیبوو. لە کاتی دزینەکەیدا گیران و دانیان نا بەوەدا کە پێیان کراوە. خانەدانەکەش چیرۆکەکەی بۆ میری گەورە گێڕابوویەوە، میریش ئەمەی پێ ناخۆش بوو کە لەژێر دەسەڵاتەکەی ئەودا کەسانێک بێن بەم شێوەیە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە. پێناخۆشبوونەکەی هیی ئەوە نەبوو حەزی لە زمانە نوێیەکە و شیعرەکان بووبێت، هیی ئەوە بوو بە سنووربەزاندنی دەزانی بۆ سەر دەسەڵاتەکانی خۆی. بۆ تەمێکردنیان، بانگی کردبوون و لەناو دیوەخاندا شت و شۆڕی بردبوون. ئەوانیش سەری خۆیان نەوی کردبوو، لە

ترسی تووڕەبوونی میر، بۆ ماوەیەک بەباشی نەیاندەوێرا باسی بکەن و خەمیان بوو دڵی میریان لێ هەڵکەنرێت و بەتەواوەتی ڕسوا ببن.

(کە فێری نانخواردنی ماڵان بوویت، هەرگیز نابیتە خاوەنی سفرەی خۆت.)

## (٧١)

**بێزار بوو لە شارەکە.**

ئەوەندە ئازاریان دا، ڕۆژانە لە بێزاریدا دەڕۆیشت بۆ لای پیاوی ناو کوخەکە.

پیاوەی ناو کوخەکە بەو گژوگیایانە دەژیا، کە کۆی دەکردنەوە و لەناو مەنجەڵێکی مسدا لێی دەنان. ئەوەندە سەفەری کردبوو بۆ شاران و میرنشینەکان، تەوای گیاکانی دەناسییەوە، دەیزانی چۆنیان لێبنێت، چۆن تێکەڵیان بکات، کامیان دەوایە و کامیان ژەهرە. بەردەوامیش سەیری ئەو ڕێگەیەی دەکرد، کە هیی قافڵەکان بوو. بەدەم سەیرکردنەوە دەکەوتە باسی خۆی، "کە سەروەت و سامانم هەبوو، شارەکە لەژێر چنگما بوو. شەوان مەجلیسەکانم پڕ بوون لە پیاوان، شەرابیان دەخواردەوە و گۆشتیان دەبرژاند و قسەی خۆش و بەسەرهاتیان دەگێڕایەوە، تەنانەت هیچ مەلایەکیش بە خراپە باسی نەدەکردم، باسنەکردنەکەیان لەبەر خاتری گیرفانم بوو.

"ئاخر مەلاکان عادەتیانە، بۆ مەستێکی هەژاری بەدبەخت

دەیکەن بە هەڵڵا، بەس ڕۆژێک لە ڕۆژان باسی شەوانی خواپێداوێک ناکەن. ئەترسن خواپێداوەکە نیگەران ببێت و دەست نەکات بە گیرفانیدا و شتێکیان بداتێ." لەو کاتانەی باسی مەلاکانی دەکرد، دەیدایە قاقای پێکەنین و بەدەم پێکەنینەوە دەیگوت، "ئەزانی میرزای بەڕێز، گەر پێت ناخۆش نەبێت، لەوەتەی مەلا هەیە، لەسەر خەڵک دەژێت. ڕۆژێک نابینی مەلایەک ئیش بکات. هەر دوو قسەی کۆن لەبەر دەکەن و بەهاتوهاوار دەیڵێن و ئیتر ئەم هاتوهاوارە دەبێت بە نان و ئاویان."

نالیی باڵدار سەیری پیاوە بەدبەختەکەی دەکرد و بیری لە خۆی دەکردەوە. نەیدەویست جارێکی تر بداتەوە لە کێوەکان. نەشیدەویست وەک ئەم پیاوە دوور لە شارەکە لە گۆشەیەکدا بە خەیاڵی هاتنی قافڵەی ژیانەوە بژێت. بێزاریش بووبوو لەو هەموو زمان خراپەیەی ناو شارەکە.

(ئەم شارە شاری هیچ کەس نییە.)

بەدەم بێزاربوونەوە ئێوارە بەرەو شارەکە دەهاتەوە.

دەچوویە دوکانی دۆستەکەی و چایەکی دەخواردەوە، گەر بەیتێکی تازەی بنووسیبایە، دەیدایە و گەر نەینووسیبایە، بەهێواشی ئێوارەکەی دەگەڕایەوە ماڵ. تا ئەو ساتەش باسی فرۆشتنی شیعر و دیوانەکانی نەدەکرد، نەیدەزانی چەندی فرۆشتووە و چەندی دەست کەوتووە. بەڵام دۆستەکەی زووزوو دەیدا بە گوێیدا، کە دۆخی بازاڕەکەی زۆر باشە و هەرکات پێویستی بە پارە بێت، باسی بکات، چونکە ئەو پارانەی لایەتی بەشی خۆیەتی. بەس ئەم گوێی پێ نەدەدا و ئەوەی بەلایەوە گرنگ بوو، کردی.

هێندەش دڵفراوان بوو لەناو چایخانە و کۆڵانەکان، کتوپڕ چاوی بە یەکێک لەوانە دەکەوت لەپشتەوە خراپیان پێ دەوت، ڕێزێکی زۆری دەگرت و چاکوچۆنییەکی گەرمی لەگەڵ دەکرد. ئەوانیش دەچوونەوە ئەم چاکوچۆنییەیان بەو جۆرە لێک دەدایەوە، گوایە دەیەوێت خۆی لێیان نزیک بکاتەوە و حاڵی نووسینەکانی لەناو خەڵکدا خراپە، بۆیە هەوڵی خۆنزیکبوونەوە دەدات.

(مرۆڤی گوماناوی ژیان ژەهراوی دەکات.)



# (٧٢)

**لەسەر جێگەکەی دانیشتبوو.**

سیگاری دەکێشا و سەیری ئاسمانی دەکرد.

سالمی پەنجەشین خەبەری بوویەوە. گڕی سیگارەکەی دەبینی لەناو شەوەکەدا دەبریسکایەوە، حەزی کێشانی دانەیەک دای لە سەری و هاتە دەرەوە. لەتەنیشتیەوە دانیشت و دەستی برد بۆ توورەکە توتنەکە و پەڕەسیگارێکی دەر هێنا و تووتنی تێ کرد و زمانێکی پیا هێنا و مودنەکەی لەسەر قەراغی پەنجەرەی بەردەم هەیوانەکە هێنا و دانەیەکی داگیرساند. هەردووکیان پێکەوە سیگاریان دەکێشا و بەبێدەنگی سەیری ئاسمانیان دەکرد.

سالمی پەنجەشین ئەم ماوەیە بووبوو بە گری لە دڵیدا بۆچی دۆستەکەی نیگەرانە و حەز بەناو شار ناکات. خەمی بوو لەم نیگەران بووبێت. ئەمەی بە فرسەت زانی و لێی پرسی، "باڵداری دۆست... دەتوانی پێم بڵێیت بۆ نیگەرانی؟"

"لەم خەڵکە خراپە نیگەرانم."

"سەرەتا پێم وتی، لێرە سەرخوراندنی خۆشت ئاسان

نییە. خۆت لە سەرەتاوە ئەمەت دەزانی، جاری پێشوو هەراسانیان کردی و ئەم جارەش لە بەرچاوت بوو بە هەمان شێوە دەبێت."

"جاری پێشوو جیا بوو، ئەم جارەش جیایە. ئەم جارە من ویستم ببنە خاوەنی خۆیان. ئەمانە تەنانەت نایانەوێت خاوەنی خۆشیان بن."

"بێگومان هیچ شتێکیان ناوێت هیی خۆیان نەبێت."

"کە وایە بۆ نیگەران نەبم. نەک نیگەران، بەڵکو بێزاریشم. لەنێوان مانەوە و ڕۆیشتن، گەڕانەوە و چوون بۆ شوێنێکی تر دۆش داماوم!"

"ئەمە چ قسەیەکە. یانی چی ئەم قسەیە. چۆن دەبێت تۆ وا بیر بکەیتەوە."

"وا بیر دەکەمەوە و پیاوی ژیر بە پێی پەتی لەناو دڕکا ناگەڕێت."

"باشە با وای دانێن ئەمانە هەمووی دڕکن، خۆ لەناو ئەو دڕکانەشدا گوڵی زۆری لێیە."

"من گوڵەکانیش دەبینم و دڕکەکانیش دەبینم. بەس نیگەران مەبە، تۆ کوڕی ئەم شارەیت، بەس من غەریبەم بەم شارە. مادام غەریبەم، غەریبە لە هەرشوێنێک بێت، غەریبەیە. کە وایە بۆ لە شوێنێک نەبم ئازاری ئەو غەریبوونەم نەدەن."

"لە هەستەکەت تێدەگەم، بەس دەبێت بیرت نەچێت لەم شارەدا دەیان دۆستی وەک منت هەیە."

دەستێکی خستە سەر شانی و زۆر بەسۆزەوە پێی وت، "خزم!" ئەمە یەکەم جاری بوو بە خزم ناوی بهێنێت. "من و تۆ بەڕاستی دۆستین. گەر تا ئێستاش مابمەوە، لەبەر

دوو دۆستی وەک تۆیە. بەڵام بۆ لێت بشارمەوە، بەتەواوەتی گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی ئەم شارەی ئێتر شوێنی من نییە. ناڕۆم تا خەونەکەم بەتەواوەتی بێتە دی."

"ئەی ئەوە نییە هاتووەتە دی؟"

"نا، هێشتا قۆناغێکی ماوە. کە ئەو قۆناغەشی تێپەڕاند و هاتە دی، ئەو کاتە غەریبییەکەم دەگوازمەوە بۆ شوێنێکی تر."

# (٧٣)

**هۆدەیەکی نوێ.**

کچەی شێخ، فەرشێکی کاشان و دوو جاجم و جێنوێنێک و دوو-سێ پشتی و سینییەکی مسی پڕ لە میوەی لە هۆدەکە دانابوو. بەجوانی پاکی کردبوویەوە و کەلوپەلەکان بەڕێکوپێکی لە شوێنی خۆیان دانابوون. دیوانێکی خۆی و کۆمەڵێک دەستنووس و مەرەکەب و تیانووس و قامیشی پێکەوە لەسەر تاقی پەنجەرەی هۆدەکە دانابوون.

ئێوارە گەڕانەوە، لەسەر نانخواردن بە نالیی باڵداری وت، "هۆدەکەت حازرە!"

ئەویش بەسەرسووڕمانەوە پرسیی، "هۆدەی چی؟"

کچەی شێخ باسێکی هۆدەکەی بۆ کرد و باسی ئەوەشی کرد پێشووتر بیریان لەوە کردبووەوە، کە هۆدەیەکی بۆ چاک بکەن، بۆ ئەوەی ئەم زستانەی لە بەردەمیاندایە لەوێ بۆ خۆی بژیت، وتیان هەرکاتێک پێت خۆش بوو بچیتە دەرەوە بچیت و هەرکاتێکیش حەزت لە ماڵ بوو، ئیتر هۆدەی خۆت هەبێت.

لە دڵەوە پێی خۆش بوو. حەزی دەکرد شوێنێکی هەبێت، بەپێی کات و ساتی خۆی لەو شوێنەدا بخەوێت و بیر بکاتەوە و بنووسێت. بەزەردەخەنەوە هەڵسا چوو سەیرێکی هۆدەکەی خۆی کرد. هاتەوە و بەدەم پێکەنینەوە وتی، "ڕاستی، ئەمە دیوەخانە و هۆدە نییە. بۆ چەندین ساڵ دەچێت شتێکی وام بە خۆمەوە نەدیوە. گەر ئێوەش پێتان خۆش نەبێت، حەز دەکەم سبەی بچم لە یەکێک لە مەیخانەکانی ئەم شارە گۆزەکەم پڕ بکەمەوە لە شەراب و شەوان جاربەجار قومێک شەرابیش نۆش بکەم."

سالمی پەنجەشین هەڵی دایە و وتی، "جا بۆ خۆت؟ سبەی من دەچم بۆت پڕ دەکەم و تا تۆ لەم شارە بیت، ناهێڵم گۆزە شەرابەکەت خاڵی ببێتەوە."

دەستێکی خستە سەر شانی و دۆستانە پێی وت، "تۆ کەسێکی زۆر باشی."

(هیچ گەوهەرێک بەبێ کڕیار نابێت بە گەوهەر.)

چراکەی دادەگیرساند و شەوان تا دەمەوبەیان یان دەیخوێندەوە، یان دەینووسی. گۆزە شەرابەکەشی لەتەنیشتی دادەنا و هەر کە ماندوو بووایە، جامێک شەرابی تێدەکرد و دەیخوارد. ئێستا مابوویەوە سەر ئەوەی لە گۆشەی خوارەوەی حەوشەکە هۆدەیەکی بچکۆلەش بۆ کەرە بۆرەکە دروست بکەن و شوێنی ئەویش بەردەرگای ماڵەکە نەبێت.

لەو ماوەیەدا لە هۆدەکەی خۆی بوو، بەسەر زۆربەی شیعرەکاندا چوویەوە. چەندین شیعر و بەیتی تازەی نووسی. ئەوانیشی کرد بە دەستەیەک دەستنووسی نوێ و لە ڕێگەی دۆستەکەیەوە گەیشتنە ناو دەستی خەڵک و گەنجانی ناو

خانەقاکان و ناو کۆلان و بازاڕەکان شیعرەکانیان لەبەر دەکرد و دەیانوتەوە. زمانە تازەکەی باڵی کێشا بەسەر شارەکەدا و بوویە زمانێکی ئاشنا و هەندێک لە گەنجەکانیش لاساییان دەکردەوە و دەیانویست وەک ئەو بنووسن.

(سەرەتای نووسین وەک منداڵییە، بە لاساییکردنەوە دەست پێ دەکات.)

# (٧٤)

**گەڕان بەشوێن دەستنووسی عارفەکە.**

بەیانییەکی زوو، هێشتا خۆر لە کەل نەهاتبوویە دەر، خۆی کرد بە خانەقاکەدا.

یەک-دوو فەقێ لەناو خانەقاکە بوون، کە ئەمیان بینی، حەپەسان. ئەمیش نە سڵاوی کرد و نە سەیریشی کردن، بەرەو تاقی دەستنووسەکان ڕۆیشت. بە باوەش هەمووی هێنانە خوارەوە و دەستی کرد بە گەڕان بەناویاندا. خەریکی گەڕان بوو بەناو دەستنووسەکاندا، یەکێک لە فەقێکان لێی نزیک بوویەوە و بەشەرمەوە لێی پرسی، "میرزای باڵدار، بۆچی دەگەڕێیت؟"

"بۆ دەستنووسەکانی عارفی گەورە."

"ئاخر قوربان، ئەو دەستنووسانە لەوێ نین. لە هۆدەی مامۆستان. ئیجازەم بدەیت دەچم بۆت دەهێنم."

"دەی زۆر باشە، چاوەڕوان دەبم بیانهێنە بۆم."

فەقێکە ڕۆیشت و زۆری پێ نەچوو بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە. لێی پرسی، "چی بوو؟"

ئەویش لە وەڵامدا بەشەرمەوە وتی، "مامۆستا ڕێگەی نەدام بیانهێنم بۆت!"

"بۆچی؟ یانی بۆ کەس نییە بیانبینێت؟"

"نا... بۆ هەمووکەس هەیە بیانبینێت. بەس وتی مادام بۆ ئەوە، مەیانبە."

"ئەها... تێگەیشتم."

بە باوەش دەستنووسەکانی خستەوە سەر تاقەکە و بەرەو هۆدەی مامۆستاکە ڕۆیشت. لەوێ بەپێوە وەستابوو. سڵاوی لێ نەکرد و بەرەو دەستنووسەکان ڕۆیشت و دەستنووسی عارفەکەی دۆزییەوە. خستییە ژێر چاکەتەکەی و ویستی بەرەو دەرەوە بڕوات، مەلاکە مەچەکی گرت و پێی وت، "بۆ کوێی دەبەی."

ئەمیش زۆر بەڕەقی جوابی دایەوە، "دەیبەم بۆ ئەو شوێنەی، بۆ لای ئەو کەسەی سوودی لێ ببینێت، حەیفە ئەم دەستنووسانە لای تۆ بن."

مەلاکە نەڕاندی بەسەریدا، "ئەم دەستنووسانە موڵکی ئەم خانەقایەن." دەستی مەلاکەی بە مەچەکیەوە ڕاتەکاند و ڕۆیشت. بەدەم ڕێوە هەر بۆنی دەستنووسەکانی دەکرد و ئەمدیووئەودیوی پێ دەکردن. تا گەیشتەوە هۆدەکەی خۆی، تەنانەت ئاگای لێ نەبوو چۆن ڕۆیشت و چۆن هاتەوە و بە کام کۆڵاندا ڕۆیشت.

سێ شەو و سێ ڕۆژ نەهاتە دەرەوە. بەردەوام لەسەر دەستنووسەکان بوو. مەلاکەش ڕۆشتبوو شکاتی کردبوو، جێگری میری گەورە دڵنیایی دابوو بە مەلاکە، کە نایانفەوتێنێت و دەیانگەڕێنێتەوە. مەلاش داوای لێ کردبوو

پاسەوان بنێرێتە سەری و لێی وەر بگرێتەوە، ئەویش قبوڵی نەکردبوو. ئیتر مەلا ناچار لە خوتبەی ڕۆژی هەینیدا باسی کردبوو، وەک هێرشکەرێک بۆسەر پیرۆزییەکانی ناو خانەقاکە ناوی هێنابوو. چەند گەنجێکیش لە خوتبەکە هەڵسابوونەوە و لە داخی ئەو قسانەی مەلاکە، جێیان هێشتبوو.

پاش خوێندنەوەی دەستنووسەکان، یەک شیعری لە ستاییشی عارفە گەورەکە نووسی و ئینجا چۆن ڕۆیشتبوو بۆ هێنانی دەستنووسەکان، ئاواش گەڕاندنیەوە شوێنی خۆی.

(تۆ کە لە من تێناگەیت، بۆ لەبارەمەوە قسە دەکەیت.)

## (٧٥)

**تەنیایی گەمارۆی دابوو.**

شەوان تا درەنگانێ لەگەڵ خوێندنەوە و نووسین دەژیا.

بە ڕۆژ کەمێک درەنگ لە خەو هەڵدەستا، نزیکەی نیوەڕۆیان خەبەری دەبوویەوە، شتێکی سووکی دەخوارد و شتێکیشی دەدا بە کەرەکە و ئامادەی دەکرد و پێکەوە دەچوونە دەرەوە. بەناو کۆڵانە باریکەکاندا بۆنی خشتە سوورەکان تێکەڵ بووبوو بە گەڵا تازە چرۆکردووەکان. منداڵانی هاروهاجیش خەریکی یاری دەبوون. برۆکانی دەهێنانەوە یەک و سەیری ئەو دیمەنانەی دەکرد بەدەم ڕێوە دەهاتنە بەرچاوی. هەرچەندە وای لێ هاتبوو زۆربەی خەڵکی شارەکە دەیانناسی، ئەما حەزی لەوە بوو هەمیشە بەتەنیا لە شوێنێک دانیشێت و تاقەتی قسەکردنی نەبوو.

ئەوانەی لە نزیکەوە دەیانناسی، دەیانزانی لە چ دونیایەکدا دەژی و بەو هەڵسوکەوتانەی نیگەران نەدەبوون. ئەوانەشی نەیاندەناسی، وا هەستیان دەکرد هەڵسوکەوتەکانی هی ئەوەیە خۆی بە شت دەزانێت، کەچی تاقە شتێک بیری

لێ نەکردبوویەوە، ئەو گومانە خراپە بوو خەلکی نەناس هەیانبوو لەسەری. تەنیاییەکەی لەو تەنیاییانە نەبوو درزی تێ بکەوێت.

(تەنیاییەک لە ناخدا ماڵی خۆی دروست کرد، بە ژیانی دەرەوە تێک ناچێت.)

کە لە چایخانەکان دادەنیشت، کەسانێک هەبوون حەزیان لێ بوو لێی نزیک ببنەوە و بیدوێنن. بەس ئەو بە جۆرێکی ساردوسڕ جوابی دەدانەوە، یەکسەر ئەو کەسانە پاشەکشێیان دەکرد و دوور دەکەوتنەوە و لە پاشەملە زەمیشیان دەکرد. هەستکردنەکەی بە تەنیایی هیی ئەوە نەبوو زۆربەی تەمەنی گۆشەگیر بووە، هیی ئەوە بوو هێندە مرۆڤەکان ئازاریان دابوو، بە نزیکبوونەوە لە مرۆڤ، هەستی بە دوورکەوتنەوە دەکرد لە خۆی.

(هیچ خەنجەرێک هێندەی زمانی مرۆڤ تیژ نییە.)

وای لێ هات لە هۆدەکەی خۆی بۆ دەرەوەی شار و لە دەرەوەی شار و بۆ هۆدەکەی خۆی. شەوانیش هێندە شەرابی دەنۆشی، خەریک بوو قاچەکانی ئازاریان زیاد بێت. کەیفیشی بەوە نەدەهات بچێتە تاقە مەیخانەکەی شار و دەترسا بەدمەست بێت و کەسانێک بناسێت بۆ مەستبوون شەراب بنۆشن، نەک بۆ کوژانەوەی برینەکان و داگیرسانی ڕوناکییەکەی ناخ.

سالمی پەنجەشین لە ئازارەکەی تێدەگەیشت. هەرگیزاوهەرگیز نەیدەویست حەق بە خۆی بدات پێی بڵێت، ئەمە بکە و ئەوە مەکە، وا بڕۆ و وا مەڕۆ. پیاوێک نەبوو ئیتر بتوانی ئامۆژگاریی بکەیت. ڕێگاکانی ژیانی خۆی ئەو

ڕێگایانە بوون، کە هۆش و بیری تێدا بوون و پێویستی بە ڕێپیشاندەر نەبوو. تازە گەیشتبوویە شوێنێکی ژیان، بێزار بووبوو لە شارەکە، لە خەڵکەکە، لە خۆی. لە هەموو ئەو شتانەی نزیک بوون لێیەوە و کەڵکی ئەوەی نەمابوو کەس پێی بڵێت بۆ وا. دەبایە لێگەڕێیت وەک بەلەمێکی ناو دەریا با بۆ کوێی دەبات، بیبات و لە هەرشوێنێکەوە گەیشتە کەناراوێک، بگات.

# (٧٦)

**شەوی نیگەرانییە زۆرەکە.**

شەوەکەی شەرابێکی زۆری خواردەوە.

هەستەکەی ناخی بەهێواشی لە چاوەکانییەوە هاتە دەر و بوو بە فرمێسک و نەرم نەرم فرمێسکەکانی دەکەوتنە کۆشییەوە. ڕووناکیی چراکە دەیدا لە فرمێسکەکان و بەسەر ڕوخسارە ئەسمەرەکەیەوە دەهاتنە خوار و وەک دڵۆپەی ماڵێکی قوڕین لە گۆناکانییەوە بە خێراییەکی زۆر بەر دەبوونەوە. ئاگای لێ نەبوو سالمی پەنجەشین بەخەبەرە و هاتووەتە پشت دەرگاکە و سەیری دەکات. لە گەرمەی بوونی تەنیایی و ئازارەکانی بە فرمێسک، دەرگاکەی کردەوە و لەتەنیشتی دانیشت.

"هەست ناکەیت زۆر خراپ خۆت ئازار دەدەیت؟"

"نا دۆست، وا نییە. مرۆڤ بەرد نییە، مرۆڤ وەک توێکڵی سێوە، یەک جار برینداری بکە، ئیتر تا بەربوونەوەی لە ژیان ئەو برینەی چاک نابێتەوە. من جارێک نا، هەزار جار بریندار کرام. بەتەمای چیت؟"

"هەموومان بریندار کراوین. ئەوەی ویستی لەگەڵ مرۆڤدا بژیت، دەبێت چاوەڕێی برینداربوونیش بکات."

"من نەزان نیم. چاوەڕوان بووم، بەس بەم جۆرەی ئێستا نا. هێشتا لەوە تێناگەم ئەمانە بۆچی چێژ دەبینن لە ئازاردانی من. من چیم کرد، هاتم دونیا ڕەشوسپییەکەم لە بەرچاویان گۆڕی و کردم بەو دونیا ڕەنگاوڕەنگەی، کە ئەوان نەیاندەزانی ڕەنگاوڕەنگە."

"قسەکانت ڕاستن. بەس ئەم هەموو ئازار و تەنیایی و هەستەی لە تۆدا کۆ بووەتەوە، لەکۆتاییدا دەتکوژێت."

"نامکوژێت، دابەشم دەکات. دابەشم دەکات بەسەر ئێرە و شوێنێکی تردا. دابەشم دەکات بەسەر مردن و ژیاندا. ئێستا ئەو دابەشبوونەی خۆم دەبینم. من نە خەیاڵم، نە بیرکردنەوەم، نە هۆشم لێرە نییە. ئەوەی دەبینیت میرزایەک و کەرەکەیەتی، بەڵام ئەم میرزا و کەرەی لێرە نین و کەچی لێرەن."

"مەبەستت چییە؟"

"مەبەستم ئەوەیە، پێیەکانم داوای ڕۆیشتم لێ دەکەن. ڕۆحم، هۆشم، هەموو شتێکم داوای ڕۆیشتنم لێ دەکات."

(مرۆڤ کە خەونی گەورەی هەبوو، ئیتر شوێنی نابێت.)

ئەو زۆری پرسی و ئەم جوابی دایەوە. ئەو زۆری وت و هیچی لە ناخی ئەم نەگۆڕی. دیمەنێکی دروست کرد، ئاسایی بێت سبەینانێک لە خەو هەڵسن و ئەو لە ماڵ نەبێت. ئەم هەواڵەی سالمی پەنجەشینی نیگەران کرد. دەیشزانی ئیدی گەڕیدەیەکی وەک ئەو، نە شوێنی هەیە و نە وابەستەیە بە شوێنەوە. ئەوەی ئەو بەشوێنیدا دەگەڕێت، خەونەکانیەتی، نەک شار و ماڵەکان، نەک ژیان.

## (٧٧)

**ناچاربوونی میری گەورە.**

زمانەکە باڵی کێشا بەسەر شوێنەکاندا.

لە دیوەخانەکان بوویە شوێنی قسەوباسی سەرەکی. یەکێک لە میرەکانی بۆتان نامەیەکی بە زمانی کرمانجی بۆ میری ئەم شارە ناردبوو. ئەمیش کە بینیبووی ئەو بە زمانی کرمانجی نامەی بۆ ناردووە، بەم زمانە تازەیەی نالیی باڵدار دروستی کرد، وەلامی دایەوە. وەلامەکەی میر بەم زمانە تازەیە لەباتیی زمانە فارسی و عەرەبییەکەی جاران، بوو بە باسی مەجلیسی شار و هەندێکیان شانازییان پێوە دەکرد و هەندێک کەس دەترسان لە بەکارهێنانی و وایان دەزانی بەکاری بهێنن، ئیدی دراوسێی میرنشینەکان نیگەران دەبن. کاتێک میری بۆتان نامەکەی میری بینبوو بەم زمانە، زۆر کەیفخۆش بووبوو، بەو بۆنەیەوە کۆمەڵێک دیاریی بۆ میر ناردبوو، پێشی ڕاگەیاندبوو، کە ئەم دیارییانە هیی بەرسقی نامەکەیەتی کە بەو زمانە شیرینەی کورد نووسیویەتی. ئەم هاندانەی میری بۆتان، میری وا لێ کرد مەجلیس ئاگادار

بکاتەوە بڕیارێک بدەن.

جێگری میر خۆی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ زمانە نوێیەکە بوو. بۆیە بە زۆرینەی دەنگ بڕیاریان دا ئەم زمانە شیرینە نوێیە بکرێتە زمانی میرنشینەکە. هەوڵیش بدرێت زیاتر گەشەی پێ بدرێت و زمانزانان کۆ بکرێنەوە بۆ ئەوەی زمانەکە وا لێ بکەن لە بەردەم زمانی میرنشینەکانی دراوسێدا هەست بە لاوازیی خۆی نەکات.

بڕیارەکەی مەجلیس و میری گەورە شاعیر و نووسەرە کۆنەکان و دەرباری نیگەران کرد. زۆر کەسی تریشی دڵخۆش کرد. لەناو ئەوانەدا کە زۆر دڵخۆشییان پێوە دیار بوو، سالمی پەنجەشین بوو. ئەما نالیی باڵدار دڵخۆشییەکەی ناخی خۆی دەر نەخست و لەناو خۆیدا هێشتیەوە. حەقی خۆشی بوو، ئەوێک لە هەموو لایەکەوە ئازاریان دەدا و هەموو گیانیان کردە برین لەسەر ئەم زمانە تازەیە، ئیتر بۆ دڵخۆش نیبێت؟ ئەم شارە لەوە بێڕەحمترە هەست بکەیت تۆ غەریب نیت لەناویدا. شارێکە نایەوێت ناسنامەت پێ بدات تا دەبیتە ئەستێرە، کە بوویتە ئەستێرە، دەیەوێت بتکات بە هیی خۆی، ئەوەشی بیناسێت، نایەوێت لە کاتی ئەستێرەبوونیدا بیێت بە هیی ئەم شارە.

زۆربەی خەڵکی ئەم شارە هەموو هونەرەکەیان ئەوەیە، خۆیان بە ئەسڵی شارەکە دەزانن. ئاخر هونەر کەی لەوەدایە تۆ خەڵکی کام شوێنی، هونەر لەوەدایە تۆ چی دەکەیت لەم دونیایەدا و دەتەوێت چی بکەیت، نەک سەر بە کام شوێنی و کام شوێن زادگەی تۆیە.

بەم بۆنەیەوە مەجلیسی شارەکە شایی و لۆغانێکی رێک

خست، ئەوەی نەچوو بۆ شایی و لۆغانەکە، نالیی باڵدار بوو. کەچی هەر ئەوانەی تا دوێنێ تانەیان لێ دەدا و ئازاریان دەدا، لەناو شایی و لۆغانەکەدا سەرچۆپییان گرتبوو و بەریان نەدەدا و هاواریان دەکرد، "بووین بە خاوەنی زمانی خۆمان!"

سالمی پەنجەشین کاتێک ئەو دیمەنانەی بینبوو، سەری سووڕ مابوو. لە جێی خۆیەوە بە جێگری میری وتبوو، "ئەوەی نالیی باڵدار لەسەر ئەم خەڵکەی دەڵێت، زۆربەی ڕاستە و گەیشتوومەتە ئەو بڕوایە، مرۆڤی ئەم سەردەمە دیوی نییە."

(ئەم خەڵکە پارچەپارچەت دەکەن و پاشان پێت دەڵێن، بۆ خۆت کۆ ناکەیتەوە.)

## (٧٨)

**کەوتنی بازاڕی کتێبە کۆنەکان.**

دوای شایی و لۆغانەکە دیوانەکە باڵی گرت.

شەوەکەی تا درەنگانێک لەگەڵ کچەی شێخی ژنی لە شاییەکە بوون. شەو ڕۆیشتنەوە، لە پەنجەرەوە سەیری کرد، بینیی دۆستەکەی چراکەی کز کردووە و خەوتووە. هێندە بەخۆشی بەپشتا خەوتبوو، وەک بڵێیت ئەم هەڵلایەی لەم شارە ڕوو دەدات، پەیوەندیی بەوەوە نییە. بۆ بەیانی کە هەڵسا، بینیی لە هۆدەکەی خۆی نییە، سەیری هۆدەی حەوشەکەی کرد، کەرە بۆریشی لێ نەبوو، دڵی داخورپا نەکا ڕۆیشتبێت! نانی نەخوارد و ڕۆیشت بۆ دوکان. لە دوورەوە بینیی کۆمەڵێک پاسەوان و خەڵک پێکەوە لە بەردەم دوکانەکەی وەستاون.

سڵاوێکی لێ کردن و هەریەک لە پاسەوانەکان لەلایەن کوێخایەکەوە، یان ئەندامێکی مەجلیسەوە هاتبوو بۆ ئەوەی دیوانێکی نالیی باڵداری بۆ بنووسێتەوە و بیبەن. هەموو ئەوانەی هاتبوون داوای کتێبە کۆنەکانیان نەدەکرد. ئەویش

ناوی یەکبەیەکیانی نووسی و داوای لێ کردن بەڕێز و بەپێی ڕیزبەندییەکە دیوانیان دەداتێ. ئەو چەند دیوانەی نووسیبوونیەوە، پێی فرۆشتن و پاشان پێی وتن، "بەم نزیکانە ئەوانەی تریش تەواو دەکەم و وەرن بیانبەن."

کە کڕیارەکانی بەڕێ کرد، سەیرێکی ناو کتێبخانەکەی کرد و بەئاهەهەڵکێشانەوە، کە پڕ بوو لە خۆشی و پڕیش بوو لە خەمگینی بۆ ماندووبوونی خۆی لەسەر دروستکردنی کتێبەکان، وتی، "ئەی داد! کێ دەیزانی میرزایەکی ناو گوندێکی ئەو دەشتودەرە دێت، وەک ڕەشەبا هەموو شتێک لەگەڵ خۆیدا ببات. ئێوە ئەی کتێبە کۆنەکان، ئەی نووسەرانی خەوتووی ناو کتێبە کۆنەکان، من بە جۆرێک ئێوەم نووسیوە، ڕۆژێک بێت بخوێنرێنەوە و منیش سوودێکتان لێوە ببینم. سەیر بکەن، ئێستا چی ڕووی داوە! کەس بەلای ئێوەدا نایەت. ئیشی گەورە پەیوەندیی بە قەبارەی کتێبەکانەوە نییە. با ئێوە هەر قەبارەتان گەورە بێت، ئەوەتا ئەمڕۆ تۆزتان لەسەر نیشتووە و دیوانێک هەمووتانی خستە ناو ڕەفەی کتێبخانەکانەوە تا بۆخۆتان بخەون."

لەبەر خۆیەوە بەم جۆرە قسەی بۆ کتێبەکان دەکرد. کتوپڕ نالیی باڵدار خۆی کرد بە ژووردا. لە جاران پیرتر و لە جاران خەمگینتر دەینواند. کە چاوی پێی کەوت، ئاهێک هاتەوە بە بەریدا و باوەشێکی پیا کرد، "ترسام ڕۆشتبیت!"

پێکەوە چایەکیان خوارد. سالمی پەنجەشین یەک توورەکە پارەی دەر هێنا و لەسەر مێزەکە دای نا.

"ئەمە چییە؟"

"ئەوە حەقی تۆیە."

"من بۆ حەق دیوانم نەداوە بە تۆ!"

"ئەزانم، بەس ئەوە حەقی تۆیە و من دوو ئەوەندەم بۆ خۆم بردووە."

"هەرکات پێویستم پێ بوو، پێت دەڵێم."

"بە گیانی دۆستایەتیمان ئەوە ناچێتەوە گیرفانی من."
بەزۆر پارەکەی کرد بەناو گیرفانی کەواکەیدا و بێدەنگییەک کتێبخانەکەی داپۆشی.

## (٧٩)

**ئێوارەکەی کەلوپەلی دەکڕی.**

چەند دەسکە کەوەر و کەرەوزێکی هەڵگرت و بەقاڵەکە پارەی لێ وەر نەگرت.

ڕۆیشتە ئەولاوە میوەی کڕی، کابرای دوکاندار سەد تەلاقی خست پارە وەر ناگرێت. لەمسەرەوە تا ئەو سەر هەرچیی هەڵگرت، کەس پارەی لێ نەسەند. دەیەویست لەو کیسە پارەیەی پێیەتی، شتێک خەرج بکات، کەچی نەیانهێشت کیسە پارەکە بکاتەوە. لەلای مەیخانەکە لای دا گۆزەیەک شەرابی هەڵگرت، کابرای مەیفرۆش پیاوێکی گاوری کامڵ بوو. کە زانیی ئەوە، گۆزەیەکی بچووکتریشی خستە سەر گۆزەکەی خۆی و سوێندی بە خاچەکەی مەسیح خوارد پارە وەر نەگرێت. سەری سووڕ نەما لەم لوتفەی خەڵکە سادەکە، چونکە ئەوان هەر لە سەرەتاوە لەگەڵی باش بوون و ڕێزیان دەگرت.

لە ڕێگای ماڵ، کتوپڕ چاوی بەو مەلایە کەوت کە لەسەر دەستنووسەکەی عارفە گەورەکە پەلاماری دا و شکاتی لێ

کرد. مەلا هەر لە دوورەوە بە قوربان قوربان بەرەورووی هات. ئەمیش زۆر بەساردی جوابی دایەوە. مەلا ویستی بە خاکی حیجاز سوێند بخوات ئەبێت بچنەوە بۆ ماڵی خۆی، ئەمیش داوای لێبوردنی کرد و وتی، "مەلا گیان، من شەرابم کڕیوە، شەراب لەگەڵ خەیاڵی جوانا دەخورێتەوە، نەک لەگەڵ مەلایەکدا."

مەلا قسەکەی پێ سەخت بوو، ئەما نەیهێنا بەسەر خۆیدا و دیسانەوە لوتفی کردەوە، هەرچۆنێک بێت، بەخوێنساردی جێی هێشت و کاتێ دوو هەنگاو لەیەک دوور کەوتنەوە، لایەکی بۆ کردەوە و بە کەرەکەی وت، "بینیت؟ خۆ بەباشی بینیت؟ تا ئەو ڕۆژەی میری گەورە منی بە دوژمن دەزانی، ئەمانە دوژمنم بوون، ئێستا میری گەورە ناچار بووە زمانەکەی من بکاتە زمانی میرنشینەکەی، بینیت چۆن گۆڕابوو، خەریک بوو بچەمێتەوە. تۆ خۆت بڕوات بەمانە هەیە؟ من نە بڕوام بە چەمینەوەکەیانە، نە بەستاییشکردنەکەیان، لە هەرشوێنێک پایەکت هەڵکەوێت، هەمووان پێکەوە پاڵت پێوە دەنێن بۆ ئەوەی بکەوێت و هەڵنەسیتەوە. خۆ بینیت."

(دڵ کە لە شوێنێک هەڵکەنرا، کەس ناتوانێت بیهێنێتەوە ئەو شوێنە.)

گەیشتەوە ماڵ و کچەی شێخی ژنی سالمی پەنجەشین کەلوپەلەکانی بینی بە دەستیەوە، تەواو خەجاڵەت بوو. بەدەم خەجاڵەتییەوە لە دەستی وەر گرت و پێی وت. "دەتەوێت کیسەجیایی بکەیت. لەبەر خاتری ماندووبوونت نەبووایە، هەر وا دەمدان بە دراوسێکان."

ئەمیش زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و بەدەم زەردەخەنەوە

جوابی دایەوە، "نا شتی وا نەکەیت، شەرابەکەم لەدەست دەر دەچێت. کیسەیەک پارەم پێ بوو ویستم هەندێکی خەرج بکەم، دونیاکەی من وا گۆڕاوە، کەسیش پارەم لێ وەر ناگرێت، تۆ بڵێی ئەوەش فەرمانی میر نەبێت."

هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین و دەستیان کرد بە شوشتنەوەی میوەکان و پاککردنی سەوزەکان، تا سالمی پەنجەشین گەڕایەوە ماڵ، نانێکی خۆشیان حازر کرد و سێقۆلی وەک هەمیشە لەسەر سفرە بەدەم قسەکردنەوە ئێوارەیەکی خۆشیان بەڕێ کرد.

# (٨٠)

**خەونی ترسناک...**

ئێوارەکەی زۆری خوارد و تا کاتی خەویش دەستی لە شەراب هەڵنەگرت.

هەر کە سەری خستە سەر بالیفەکە، خەونی بینی. خەونەکەی زۆر لە خەونەکەی جاران ترسناکتر بوو. درەختە سووتاوەکانی ناو بەشی دارستانەکە قسەیان دەکرد. مرۆڤە شەڕکەرەکان لە شوێنی خۆیان ڕەق بووبوون. کەس نەدەجووڵا، لەبریی مرۆڤەکان، درەختەکان نیشتبوونە سەر یەک. بە وشکی و سووتاوی لقوپۆپی یەکتریان دەشکاندەوە. پڕ بە دەمیان هاواریان دەکرد، "ئیتر تۆ نابێت بێیتە ناومان. ئیتر تۆ لە ئێمە نیت. تۆ هاتیت سووتاوییەکەی ئێمە چاک بکەیتەوە، خۆشت پڕ بوویت لە برین و سووتاوی. تۆ سەیری خۆت بکە." سەیری خۆی کرد، پرچەکانی ڕەش هەڵگەڕاون، توێکڵی پێستی سەر دەستەکانی وشک بووەتەوە و هەڵدەوەرێت. لووتی لە ناوەڕاستی دەموچاویدا لەتێکی پێوە نەماوە و پەنجەکانی قاچی نیوەیان بوون بە کۆتەرە

و نیوەشیان گۆشتەکەیان بەدەرەوەیە. بە سەیرکردنی خۆی، خەریک بوو زیڕە بکات.

دەنگەکانی ناخی کپ بووبوونەوە. نە دەنگی بەشە سەوزەکەی دارستانەکە دەهات، نە دەنگی مرۆڤەکەی ناخی. لەبریی ئەوە، وەک کۆتەرەیەک لەو نێوانەدا وەستابوو. درەختە شەڕکەرە سووتاوەکان هاواریان دەکرد بەسەریدا.

دەیویست دەستەکانی، قاچەکانی، بجووڵێنێت، بەڵام نەیدەتوانی. هێزی دەدایە بەر خۆی و هیچی پێ نەدەکرا. ئاسمان هەورێکی ڕەشی هێنا، بارانێکی بەخوڕ دای کرد. دڵۆپەبارانەکان هێندە گەورە بوون، کە دەیانکێشا بە لقێکی درەختە سووتاوەکاندا، دەیشکاندن. دەیانکێشا بە هەر مرۆڤی شەڕکەری بەبتبووی ناو بەشە سووتاوەکەی دراستانەکەدا، دەیکرد بە هەزار پارچەوە. چاوی بڕیبووە پارچەپارچەکردنی درەخت و مرۆڤەکان بەدەست بارانەوە. گرمەیەکی گەورە هات.

کە سەیری بەردەمی خۆی کرد، لەوسەرەوە یەک شەپۆلی ئاو بەرەو ڕووی دەهات. هەرچەندی کرد نەیتوانی خۆی لا بدات. قاچەکانی نەدەجووڵان. لەو ساتەی خەریک بوو ئاوەکە بدا بەسەریا، دوو باڵی گەورەی لێ دەر هاتن و هەر ئەوەندە ڕای وەشاندن، بەرەو ئاسمان فڕی. بە ئاسمانەوە سەیری دارستانەکەی دەکرد. لە لایەک وێران و لە لایەک پڕ لە ژیان.

حەزی نەدەکرد بنیشێتەوە.

وەک باڵندەیەک بەو ئاسمانەوە دەفڕی. لە وەختی فڕینەکەدا تووشی بوو بە تووشی پۆلێک مەلەوە. لە زمانی

مەلـەکان تێدەگەیشت. گوێـی لـێ بـوو سـەرقافڵەی مەلـەکان ئامۆژگاریـی مەلەکانـی دەکـرد.

(خۆتان لە مرۆڤ لا بدەن، با ژیانتان پارێزراو بێت.)

تێکـەڵ بـە قافڵـەی مەلـەکان بـوو. کەسـیان لێـی نەترسـان، کەسـیان نەیگـوت تـۆ مرۆڤـی. خـۆی لـێ بـوو بـە مـەل و بـە خەیاڵـی مەلبوونـەوە گوێـی لـە ئامۆژگاریـی سـەرقافڵەکە دەگرت. دەنگێـک ڕای چڵەکانـد، دیسـانەوە کـەرە بـۆر بـە زەڕیـن ڕای چڵەکانـد و لـە خەوەکـەی کـرد.

بـۆ لێکدانـەوەی خەونەکـە نەگـەڕا. وای دانـا ئێـوارە زۆری خـواردووە و فشـاری خۆراکەکـە ئـەم خـەوەی هێناوەتـە نـاو خەونەکانیـەوە.

## (٨١)

**تاریک و ڕوون بوو.**

بەئەسپایی چراکەی خامۆش کرد.

دوو گۆزە شەرابەکەی پێچایەوە، جاجمە بەدەستچنراوەکەی خۆی، لیفە و سەرینە بەدەستچنراوەکەی خۆی کۆ کردەوە و بەواشێک دەرگاکەی داخست. چیی پێویست بوو، خستیە ناو توێشووەکەیەوە. گۆزەیەک لەتەنیشت حەوزی ئاوی حەوشەکە بوو، بە خەتێکی درشت لەسەر گۆزەکە نووسیی، "خزم من ڕۆیشتم، ئیتر بارگرانی نابم بۆ کەس، تەنانەت بۆ ژیانیش بارگرانی نابم."

کورتانەکەی خستە سەر شانی کەرەوە و لە دەرگای حەوشە وەدەر کەوتن. بە کۆڵانە باریک وتاریکەکاندا ڕۆیشتن. گەیشتنە ناو بازارە چۆڵەکە، بازاڕ بۆنی میوە و سەوزەی گەنیوی دەدا. گەیشتە سەر سەکۆی شاعیرەکان، لە بەردەم سەکۆکەدا وەستا و تاوێک بەچۆڵی لێی ڕوانی. "ئەی بازاڕی شاعیران، ڕۆژگارێک دێت تێدەگەن ئەوەی ئێوە فرۆشتتان، خۆتان بوون، نەک وشە. ئێوە وشەتان کرد بە کاڵا، وشەتان

کرد بە قووتی نان. ئێوە هیچ شتێکتان نەهێشتەوە بەجوانی. خۆتان بەرگێک دەپۆشن و ناختان بەرگێکی تر، هەرکەسێک فریوی ئێوە بخوات، تا مردن ئاسوودە نابێت."

لە دەروازەی شارەکە بەرەو کوخی پیاوە گۆشەگیرەکە ڕۆیشت. لەوێ لای نەدا، بەرەو ئەو ڕێگەیە ڕۆیشت، کە پیاوەکە پیشانی دابوو، ڕێگەی ئاوریشمەکە. گەیشتە سەر ڕێگاکە، دوو بەش بوو، بەشێکی بەرەو ڕۆژئاوا و بەشێکی بەرەو ڕۆژهەلات. ڕێگای ڕۆژئاوای گرتە بەر. تا خۆر دەر هات، شارەکە لە بەرچاوی ون بوو. هەتا زیاتر دوور دەکەوتەوە لە شارەکە، زیاتر هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد. شارەکە قورساییەکی خستبوویە سەر سینەی، تەنها بە دوورکەوتنەوە لێی، ئەو قورساییەی کاڵ دەبووەوە.

نیوەڕۆکەی گەیشتنە نزیک شارێکی گەورە، نەچووە ناو شارەکەوە و بە هەمان ڕێگەدا دەستی کرد بە ڕۆیشتن. لە نزیکی شارەکە چاوی بە ڕێبوارێک کەوت. ڕێبوارەکە لەسەر ئەسپێکی سوور، سنگی خۆی دەر پەڕاندبوو. هەواڵی ڕێگاکەی لێ پرسی. ڕێبوارەکە پێی وت، "بەبێ ترس هەر بەم ڕێگایەدا بڕۆ، دەگەیت بە قافڵەیەک بەرەو ڕۆژئاوا دەچن. ئەوان باریان قورسە، تۆزێک پێ هەڵگریت دەگەیت بەوان.

دەمەوعەسران لەقەراغ ڕووبارێک لای دا و نانێکی خوارد، کەرەکەش لەقەراغ ڕووبارەکە دەستی کرد بە لەوەڕ. ئێوارە داهات.

ویستی لەو چۆڵاییەدا بەتەنیا نەمێنێتەوە، پێی هەڵگرت، دوو-سێ گردیان بڕی، گوێی لە زەنگۆڵەی ملی حوشترێک بوو، بەرەو ڕووی زەنگۆڵەکە چوو، نزیکی قافڵەکە بوویەوە.

لە نزیکبوونەوەیدا ئەسپسوارێک هاتە بەردەمی و تاوێ بەدەوریدا سووڕایەوە، وای زانی پیاوخراپە. کە بینیی میرزایەکی بەتەمەنی هەژارە، داوای لێ کرد بێتە ناو قافڵەکەوە. ئەو ئەسپسوارە یەکێک بوو لە پاسەوانەکانی قافڵەکە.

قافڵەیەکی گەورەی قوماش و فەرش بوو لە کاشانەوە هاتبوون بەرەو شام بچن. خاوەنی قافڵەکە خۆی لەناو عەرەبانەیەکی بەپەڕۆ دەورەدراو پاڵ کەوتبوو، پاسەوانەکانیش بە خۆیان و ئەسپەکانیانەوە لەدەوری قافڵەکە پێشوپاشیان دەکرد.

لەتەک قافڵەکەدا بەرەو غەریبییەکی گەورەتر کەوتە ڕێ.

(مادام غەریبین بەم نیشتیمانە، ئیتر لە هەرشوێنێک بین، جیاوازیی نییە.)

## (٨٢)

**شەوی سەماکەرەکان.**

ئەستێرە دەر کەوتن و قافڵەکە لای دا.

دەست کرا بە ئامادەکردنی خۆراک و شەوچەرە. خاوەنی قافڵەکە لە سەرەوە دانیشتبوو، خزمەتکارەکانیش شتیان ئامادە دەکرد. یەکێک لە پاسەوانەکان هەواڵی میرزای دابوویە خاوەنی قافڵەکە، ئەویش بانگی کردە لای خۆیەوە. کابرای خاوەنقافڵە یەکێک بوو لە بازرگانە گەورەکانی شاری شیراز. بەفارسی قسەی دەکرد، نالیی باڵداریش فارسییەکی پوختی دەزانی. پێکەوە کەوتنە باسوخواسی دونیا. هاتن... هاتن، تا گەیشتە سەر ئەدەب. کابرای خاوەنقافڵە ئەهلی شیعر بوو. دەستی کرد بە باسکردنی عەتاری نەیشاپووری و بایەزیدی باستامی و حافزی شیرازی. هەریەک لەمانە لەلایەن نالیی باڵدارەوە خەتم کرابوون. کابرای خاوەنقافڵە بیستبووی لەو میرنشینەی سەرەوە شاعیرێک هاتووە زمانە فارسی و عەرەبییەکەی تێک شکاندووە و زمانی کوردەکانی کردووە بە زمانی نووسین. لێی پرسی، "ئەری شتێکی وا

ڕووی داوە؟"

"بێگومان وایە، ڕووی داوە."

"بەهـ.. بەهـ.. ئـەوە چ پیاوێکـە. ڕاسـتە مـن فارسـم و زمانەکەی خۆم خۆش دەوێت، بەس حافزی گـەورە دەڵێت: گۆزە بۆ ئەوەیە ئاو و شـەرابی تێ کەیت. ئێ ڕاست دەکات، گۆزەی خاڵـی بەکەڵکـی چـی دێت."

"مەبەستت چییە؟"

مەبەستەکەم ڕوونـە میرزای بەڕێز. ئـەو پیاوە گۆزەیەکی خاڵی نەبووە، گۆزەیەکی پڕ بووە. مادام گۆزەکـەی پڕە، من خۆشم دەوێت."

دوو جار ویستی بڵێت ئـەو پیاوە منم، پەشیمان بووەوە، نەکا کابرا بەگاڵتەپێکردن بە خۆی تێبگات. لـەم قسانەدا بوون دەست کرا بە شـەرابخواردنەوە، کە شـەرابەکەی لێ وەر گرت، کابرای فارس سـەری سـووڕ نەما. بـەدەم نۆشـینەوە وتـی، "میرزا، خوێندەوارەکانی ئێمـەش هەمووی ئەهلی شـەرابن."

سـەماکەرەکان دەستیان کرد بە سـەماکردن. گەنجانـی ناو قافڵەکەیـان جۆش دا و ئەوانیـش هەڵسـانەوە سـەمایان کـرد. ئاگری ناوەڕاسـتی سـەماکەرەکان و خۆبادانـی سـەماکەرەکان ڕیشکەوپیشـکەی بـە چـاوی دەکـرد. ڕاسـتییەکەی، دوای ئـەو هەمـوو سـاڵە، یەکـەم جـاری بـوو ببینێت ژنانێک بـە کراسـی سـووری تەنکـی ناسـکەوە لـە بەردەمیـدا سـەما بکـەن و ڕووناکـی ئاگرەکـە دەیـدا لـە کراسـەکانیان و ڕانـە شـلەکانیان دەر دەکەوتـن.

شـەوێکی پڕ لـە ڕەنـگ و هەیاهویـان بەسـەر بـرد. کابـرای خاوەنقافڵە داوای لـێ کـرد هەتـا ئـەو شـوێنەی لەگەڵیان دەبێت،

با لەنزیکیەوە بێت و دەستیش نەکات بە گیرفانەکانیدا، چی دەخوات و چی دەنۆشێت، لەسەر حسابی ئەو دەبێت. توورەکە پارەکە هێشتا دەمی نەکرابوویەوە و چۆنی وەر گرتبوو، هەر وا بەبێ کەمبوونی دەرهەمێک مابوویەوە.

زۆر درەنگ خەوتن. دەبایە بۆ بەیانییەکەشی زوو هەڵسن. ئەم کێشەی نەبوو، پێشووتر ڕاهاتبوو، تەنها تۆزێک خەمی لەوە بوو ڕێگاکە دوور بێت و قاچە باریک و پیرەکانی یارمەتیی نەدەن بڕوات. هەر واش بوو، ڕێگاکە زۆر دوور بوو.

# (٨٣)

**پاش چەند ڕۆژێک شارێک دەر کەوت.**

شارەکە لەناو چالاییيەکدا بوو، خانووە بەرزەکانی لە دورەوە دیار بوون.

ڕێگاکە لە بەرزاييیەکەوە بەرەو خوارەوە دەکشا، شارەکەش لەناو تەختاييیەکدا شاخ دەورەی دابوو. لەنزیک عەرەبانەی خاوەنقافڵەکە بوو کە شارەکە دەر کەوت، کابرای خاوەنقافڵە پەردەکەی لا دا و سەری دەر هێنا وتی، "میرزا... ئەو شارە دەبینی، ئەوە شامە. شام جوانترین شاری ئەم دونیایەیە. شارێکە هەموو شتێکی تیایە. ئەوەی شام نەبینێت، ڕۆژهەلاتی نەبینیوە. لە خۆشیی ئەم شارە، حەز دەکەم دایمەی خودا ژیانم لە قافڵەدا بێت."

شارەکە لە مەنجەڵێکی سپی دەچوو. خانووەکانی بە بەردی سپیی گەورە گەورە دروست کرابوون. ڕێگا سەرەکییەکەی شارەکە بە ناوەڕاستدا تێدەپەڕی و شارەکەی دەکرد بە دوو لەتەوە. لەمبەروئەوبەری ڕێگاکەوە هەزاران خانووی گەورەی سپی دروست کرابوون. بەردی نەقاڕیی

سپی، پەنجەرەی گەورە گەوەرەی سپیکراو، دەرگای خۆڵەمێشی، منارە سپییەکانی مزگەوتەکان لەناو خانووەکاندا سەریان دەر هێنابوو، لە قوللەی پاسەوانەکان دەچوون کە پاسەوانی بکەن بەسەر ماڵەکانەوە.

بازاڕێکی شلوق، نەک کەلوپەل، هەزاران جۆر مرۆڤی تیا بوو. گەیشتنە لای کاروانسەرایەک و لەوێ لایان دا. دیسانەوە هەستی غەریبی ڕووی تێ کرد. لە خۆی پرسی باشە ئەم پارانە بە منن، کێ دەڵێت بەکەڵک دێن. چوویە لای خاوەنقافڵەکە و هەمان پرسیاری لەو کرد. ئەویش تورەکە پارەکەی لێ وەر گرت و سەیرێکی کردن. ڕاستەکەی میرزا، ئەم پارانە بۆ ئەم شارە نابن. خەمت نەبێت، من پارەی ئەم شارەت پێ دەدەم و ئەمانە هەڵدەگرم بۆ خۆم. کە ڕۆیشتمەوە، لەوێ دەیانکەمەوە بە پارەی لای خۆمان.

پارەکانی بۆ گۆڕییەوە و لە کاروانسەرایەک هۆدەیەکی بەکرێ گرت و لەناو مەیدانی کاروانسەراکەشدا کەرەکەی بەستەوە و توورەکەیەک کای بۆ کڕی و گەڕایەوە بۆ هۆدەکەی.

پەنجەرەکەی دەیڕوانی بەسەر شارەکەدا.

لە بەردەم پەنجەرەکەدا دانیشت. خەیاڵی گەڕاندیەوە بۆ ئەو ئێوارانەی پێکەوە لەگەڵ سالمی پەنجەشین لە بازاڕ شتیان دەکڕی و دەگەڕانەوە ماڵ. ڕوخسارە نوورانی و میهرەبانەکەی کچەی شێخی ژنی سالمی پەنجەشینی دەهاتەوە بیر. بۆنی چێشتە خۆشەکانی و چاخواردنەوەی بەردەم هەیوانەکە و سەیرکردنی شەوانی ئەستێرەکانی سەر نیشتمان.

دڵی پڕ بوو لە گریان. "من بۆچی لەم دونیایەدا شوێنێکی ئارامم دەست ناکەوێت. تۆ بڵێیت لەم غەریبییەشدا کەسێک هەبێت ئازاری پیرەپیاوێکی وەک من بدات، هەر چۆن لە نیشتمانەکەی خۆم ئازاریان دام." یەکەم ڕۆژی لە غەریبیدا، غەریبیی نیشتمانی دەکرد.

(کە بەئازارەوە ڕۆیشتی، تا مردن هیچ شوێنێک نابێت بە نیشتمانت.)

تا درەنگانێکی شەو بەردەم پەنجەرەکەی بەر نەدا. تاریکی کرد، چرای سەر ڕێگاکان داگیرسان. چراکان قەتارەیان بەستبوو بەشوێن یەکتردا، لە تەزبیحێکی زەردی شاری نەیشاپوور دەچوون، بەردەمی خۆیان ڕووناک دەکردەوە.

ئەو شەوە ئازاری دووری لە نیشتمان نەیهێشت خەو بچێتە چاوەکانی. بیریشی لە گەڕانەوە نەدەکردوە، چونکە بەتەواوەتی دڵی شکابوو.

## (٨٤)

**جێهێشتنی شارەکە.**

شەوەکەی نەخەوت. بەیانییەکەی لە کاروانسەراکە نانێکی خوارد و وەستا تا کابرای قافڵەچی لە خەو رابێت. دوای دوعاوسەلام جێی هێشت و بە ئاراستەی رۆژئاوای شارەکە کەوتە رێ. دەیویست بەرەو حیجاز بچێت. بە پرسوڕا رێگاکەیان پیشان دا. هەتا زیاتر دەڕۆیشت، خۆر تینی زیاتر دەبوو. ناچار کەواکەی داکەند و ئەویشی دا بەسەر کۆڵی کەرەکەدا. تینی بۆ هات، مێزەرەکەشی لەسەر سەری لا دا و بەس کڵاوەکەی هێشتەوە. بەردەمی بیابانێکی وشکی گەرم بوو، کەسیشی لێوە دیار نەبوو. جاربەجار قومقومەیەک دەهاتە بەردەمی و دوو سەری رادەوەشاند و بەناو خاک و خۆڵی بیاباندا دەڕۆیشت. تا نزیکەی نیوەڕۆ بەبێ وەستان رێیان کرد. لە دوورەوە تارماییەکی ڕەش ڕەش دیار بوون. سەرەتا وای دەزانی ئاوەدانییە، دوایی وردەوردە بۆی دەر کەوت ئاوەدانی نییە، گەرمایە سەراب دروست دەکات لە بەرچاوی.

باش بوو لە دەمەونیوەڕۆیان دەوارێک دەر کەوت. بەرەو دەوارەکە هەنگاوی نا، خێزانێکی دەوارنشینی لێ بوو حوشتریان بەخێو دەکرد. بەڕێزەوە پێشوازییان لێ کرد. خاوەنماڵ دیسداشەیەکی بۆری لەبەر بوو، تا نیوە هەڵی کردبوو، ناوگەڵی بەدەرەوە، پیاوێکی بەتەمەن بوو. ئەمیش کێشەی زمانی عەرەبیی نەبوو، هەر لە سەردەمی سوختەیییەوە تا فەقێیەتی و تا وەرگرتنی ئیجازە، هەر زمانی عەرەبی و فارسی و تورکیی خوێندبوو.

دوو جام ئاویان بۆ هێنا، ئاوەکە فێنک بوو، ئاوەکەی خواردەوە، پرسیی، "ئەمە چۆن لەم بیابانە ئاوی فێنک هەیە؟" خاوەنماڵەکە زیندانێکی پیشان دا، زەوییەکەیان هەڵکەندبوو، سەری زەوییەکەیان داپۆشیبوو، ئاویان تێ کردبوو بۆ ئەوەی خۆر گەرمی نەکات. لە حەوزی حوشترەکانیش کەرەکەی ئاوی خواردەوە. گۆزەیەک ئاویان پێ دا و ڕێگاکەیان پیشان دا. خاوەنماڵەکە دڵنیای کردەوە ئەم بیابانە بێمەترسییە، تەنها ون نەبیت، ئەتوانی بگەیت بە قافڵەکان. ئەمە ڕێگای قافڵەکانە و بەردەوام خەڵک هاتوچۆی لێوە دەکەن.

(ونبوو کەسێکە خۆی ون کردبێت، نەک ڕێگا.)

لە هیچ لایەک لای نەدا. بەدەم ڕێوە نانی دەخوارد. ڕۆیشتنەکەی خێرا نەبوو. ئارەقە بە هەموو گیانیدا دەهاتە خوارەوە. ئارەقە بەناو تاڵە سپییەکانی قاچیدا جۆگەلەیان بەستبوو. لەوەتەی هەیە، هێندەی ئەم ڕۆژە گەرمای نەبوو. بە ناخێکی گەرمی شکاوەوە بەرەوپیری گەرمایەک دەچوو.

نە دەرختێک، نە سێبەرێکیش نەبوو لا بدات. تەنها هەندێک جار چاوی بە کۆمەڵێک حوشتر دەکەوت شوانەکەیان

دەموچـاوی بـە پـەرۆ هەڵپێچابـوو. دوو-سـێ جار ئەمـەی بینی، ئیتر ئەویش مێزەرەکەی پێچا بە دەموچاویـەوە. دوایی شـەوەکەی بـۆی دەر کـەوت دەموچـاوی دەکزێتـەوە، گـەر مێزەرەکـەی نەپێچایـە بە دەموچاویـەوە، ڕوخسـاری دەسـووتا. تازە تاریکـی کردبوو، ڕووناکییـەک کەوتـە بەرچاوی. لـە دڵی خۆیدا وتـی، ئـەوە ئاوەدانییـە و ئەمشـە و لـەوێ ڕۆژ دەکەمـەوە.

(کـە تاریکـی هەڵـی کـرد، تـرووسـکاییی ڕووناکییەکـت لـێ دەبێتـە ژیـان.)

# (٨٥)

**قافڵەی دووەم.**

ڕووناکییەکە ئاوەدانی نەبوو، قافڵەیەک بوو.

پاسەوانەکان لێیان خوڕی. دەستی خۆی بەرز کردەوە و بە زمانی خۆیان پێی وتن، ڕێگر نییە و ڕێبوارە، ئاگرێک بەدەستیانەوە بوو و بەرەوڕووی هاتن. لێی ورد بوونەوە، ڕێبوارێکی پیری ماندووە. دڵیان سووتا پێی. پێیان وت، "بە تاقی تەنیا چی دەکەی لەم بیابانە؟ بۆچی لەگەڵ قافڵە نەهاتووی؟ هەر باشە ون نەبوویت."

ئەویش بە حاڵێکەوە کە دەنگی پڕ بوو لە ماندووبوون، جوابی دانەوە، "غەریبەیە و دەیەوێت بەرەو حیجاز بچێت." بردیانە لای سەرقافڵەکە و ئەویش جاجمێکی ڕاخستبوو، خەریکی کێشانی نێرگەلە بوو. لای خۆیەوە داینیشاند و فەرمووی لێ کرد نێرگەلە بکێشێت. ڕەدی کردەوە. پێشووتر نێرگەلەی لە دیوەخانی خانەدانەکان بنیبوو. یەک-دوو جاریش گوێی لێ بووبوو وەک شەراب حەرام کراوە. بەس نەیدەکێشا، نەک لەبەر حەرامییەکەی، لەبەر ئەوەی حەزی

لێی نەبوو.

سەرقافڵەچی ئازەری بوو. قافڵەکەی بەرەو حیجاز نەدەچوو، بەرەو قوستەنتینە دەچوو. بۆیە بە میرزای وت، ئەگەر بۆ حیجاز دەچێت، دەتوانێت تا دووڕێیانەکە بیبات. ئەو دووڕێیانەی ئەو باسی دەکرد، دوو ڕۆژی تر دەیگەیشتنێ. ئەمیش ڕازی بوو تا ئەوێ لەگەڵیان بچێت، گەر ڕێگای خۆی گۆڕی، ئەوا لەگەڵ ئەوان دەچێت و نەیشیگۆڕی، لەوێ لێیان جیا دەبێتەوە.

شەوەکەی لە کەنارێکەوە جێگای داخست و هەندێک کای پەیدا کرد بۆ کەرەکە و گۆزەیەک ئاویش بۆ هەردووکیان. ئاوەکەی دا بە کەرەکە و خۆیشی نانوشەرابێکی خوارد و لەناو تێشووەکەی دیوانەکەی خۆی دەر هێنا. لە بەردەم ئەستێرەکانی ئەو بیابانەدا سەیری دیوانەکەی خۆی دەکرد. دەبێت ئێستا لە میرنشینەکە چۆن باسم بکەن، دەبێت چەند ئاسوودە بن شاعیرەکان و دیوەخاننشینەکان کە شارەکەیانم جێ هێشت. دەبێت ئێستا سالمی پەنجەشین چیم پێ بڵێت. دەبێت میر و دەستە و تاقمەکەی هەست بە چی بکەن؟

بەدەم ئەم پرسیارانەوە چاوی قورس بوو. سەری خستە سەر سەرینەکە و لە ڕووناکیی ئەو ئاگرانەی دەڕوانی، کە قافڵەچییەکان کردبوویانەوە. لە لایەک گۆرانی دەوترا و لە لایەک یاری دەکرا و لە لایەک تریکەی ژنان دەهات و لە لایەکی تر خەوێکی قورس پێڵووی ڕێبوارەکانی داگیر کردبوو. لای ئەمیش برینێک لە ناخیدا کولابوویەوە، ئازاری برینەکە بۆنی نیشتمانی دەدا.

بۆ بەیانییەکەی لەگەڵ قافڵەکە ڕۆیشت.

ڕێگایەکی گەرم و تاقەتپڕوکێن، گەنجانی ناو قافڵەکە تەقەی سەریان دەهات. خزمەتکارەکان لە خزمەتکردنی ڕێبوارەکان ماندوو نەدەبوون. پاسەوانەکانی قافڵە جڕتوفرتیان بوو، لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر. حیلەی ئەسپەکان لەناو گەرمای بیاباندا ون دەبوو. بۆڕەی حوشترە بارهەڵگرتووەکان تێکەڵ بە سەرابەکەی بەردەمیان دەبوو.

دوو ڕۆژ بەڕێوە بوون تا گەیشتنە دووڕییانەکە. لەوێ کاروانسەرای قافڵەکان بوو. لایان دا و هەزاران حوشتر و ئەسپ و باری لێ بوو. شوێنێکی خۆش بوو لەچاو ڕێگاکەی بیابان. شەوێک لەوێ مانەوە و لەو شەوەدا بڕیاری دا بەرەو کوێ بچێت. پشتی لە حیجاز کرد و بەرەو قوستەنتینیە کەوتە ڕێ.

(مرۆڤە گەورەکان لە سات و کاتی خۆیدا بڕیار دەدەن.)

## (٨٦)

**قافڵەکە دوا کەوت.**

لە کاروانسەراکە خەڵکی زۆری لێ بوو.

بەناو بازاڕی کاروانسەراکەدا دەگەڕا، لە دوورەوە پیاوێکی بینی. بە هەمان شێوە مێزەرێک بەسەریەوە، کەوایەک لەبەریدا، کەرێکیش لەتەنیشتی. لە پیاوە نزیک بوویەوە و سڵاوێکی لێ کرد. ئەویش بەڕێزەوە جوابی دایەوە. پیاوە بە نیوەئازەری و نیوەتورکی قسەی دەکرد. ئیجازەی خواست لەگەڵی دانیشێت.

"قوربان، تۆش وەک من غەریبی؟"

"نا من غەریب نیم، خەڵکی ئەم سەرزەمینەم."

جوابەکەی تاساندی. ئەو، هەستکردن بە غەریبییەی لە خۆیدا بوو، لەچاو جوابەکەی ئەو هەستێکی گەورە نەبوو. بەوردی سەیری ڕوخساری پیاوەکەی کرد. چاوە قووڵەکانی و لووتە باریک و درێژەکەی، چەناگە باریکەکانی لەژێر ڕیشە تەنکەکەی، پەنجە قۆقزەکانی دەستی لەژێر چەناگەی، شتێکیان دەوت. دیسانەوە پرسیاری لێ کردەوە، "یانی چۆن

غەریب نیت؟"

پیاوە بە لاچاوێ سەیری کرد، "پیاوی باش، تۆ لە دونیادیدە دەچیت. مرۆڤ لەم سەرزەمینە لە هەرشوێنێک بێت، ئەو شوێنە موڵکی خۆیەتی. من بۆ ئەستێرەیەکی تر ناڕۆم تا هەست بە غەریبی بکەم. تەنها شتێک وام لێ بکات هەست بە غەریبی بکەم، ڕۆیشتنمە لەم ئەستێرەیە!"

نەخێر، دڵنیا بووەوە ئەم پیاوە کەسێکی ئاسایی نییە. بۆیە یەکسەر پرسیی، "لە کام خانەقا دەخوێنێت؟"

پیاوە زەردەخەنەیەکی کرد و وتی، "من هەموو خانەقاکان هیی خۆمن. لە نەیشاپوورەوە هاتووم. چووم بۆ حیجاز، ئێستا دەگەڕێمەوە دەچم بۆ بەغداد و لەوێشەوە بۆ شام. مالبەماڵی خودا دەگەڕێم تا زیاتر فێر بم. خوداپەرست نیم، خوداناسم. خودا کەسانێکی خۆش دەوێن بیناسن، نەک کەسانێک نەیناسن و بیپەرستن."

نالیی باڵدار وەک بڵێت شنەبایەک ناخی فێنک کردبێتەوە، بەم قسانە ناخی فێنک بوویەوە. لەسەر چۆک بوو، پوخت و پاک، چوارمشقی دانیشت و پیاوەی ڕێبواری پرسیارڕێژ کرد.

باسی دین و دونیا، باسی خەون و ڕاستی، باسی مەرگ و ژیان، باسی بوون و نەبوون، باسی جوانی و ناشیرینی، باسی خەیاڵ و فڕین، هەرچی لە بیرکردنەوەی خۆیدا بوو، کردی بە پرسیار و وەڵامی سەیرسەیری وەر گرتەوە. تا نزیکەی خۆرئاوابوون دەستی لە قسەکردن هەڵنەگرت. لە خۆرئاوابووندا جارچیی ناو قافڵەکان جاری دا قافڵەی قوستەنتینییە لەبەر خۆلادان لە گەرمای ڕێگە، بەم ئێوارەیە دەکەوێتە ڕێ. نالیی باڵدار هەڵسایەوە، بۆ یەکەم جار و

بەبێ پرس، دەستی پیاوەی ڕێبواری ماچ کرد. لە خەیاڵی خۆیدا دای نا ئەوە یەکێکە لە عاریفە گەورەکان و ئامادە نەبوو ناوی خۆی بڵێت. سوپاسگوزار بوو بۆ زانیارییەکانی. پیاوەی ڕێبواریش بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە سەرێکی بۆ ڕاوەشاند و ماڵئاواییی لێ کرد.

# (٨٧)

**لە ڕێگا بوون.**

خەیاڵی بردیەوە بۆ سەردەمی گەنجی.

ڕۆژی هەینی بوو، مامۆستاکەیان بڕیاری دابوو سەفەرێک بکاتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، ئەمانیش بە بۆنەی سەفەرەکەی ئەوەوە، ماوەیەک دەرس نەخوێنن و ئیسراحەت بن. ئەمەی بە هەل زانی و تێشووەکەی خۆی پێچایەوە و بەرەو گوندەکەی خۆیان کەوتە ڕێ. تازە مووی دەر هاتبوو. جامانەیەکی ڕەشی قوت بەسەر سەریەوە، دەستێکی جلی کوردیی قاوەیی و پشتێنێکی ڕەشی بەستبوو. بەناو toوتن و تەماتە و بێستانە کاڵەکەکاندا بە خۆشیی گەیشتنەوەی بە دیداری کچە ئەسمەرە باریکەلەکە، هەنگاوێکی دەکرد بە دوو هەنگاو. کە گەیشتەوە گوندەکەیان، هێشتا خۆر ئاوا نەبووبوو، لەبریی ئەوەی بەرەو ماڵی خۆیان بچێت، بەرەو ئەو گردە چوو کە کانیی ژنانی لێوە دیار بوو. دانیشت و سەرنجی کچ و ژنەکانی دەدا. بینیی کچەی ئەسمەر بە کراسێکی شین و کەوایەکی ڕەش لەبەریدا و گۆزەیەک بە دەستیەوە، هێواش

هێواش بەرەو کانییەکە هات. حەزی دەکرد ئەوەندە هێزی تیا بێت، ئێستا بچێتە بەردەمی و سینەی خۆی بۆ بکاتەوە. بەس ئەو هێزە نەبوو، ناچار لە دورەوە سەیری دەکرد و بەو سەیرکردنەش دڵی ئاسوودە دەبوو.

تا کچە گۆزەکەی پڕ کرد و گەڕایەوە ماڵ، خەریک بوو تاریک دابێت. بەتاریکی گەیشتەوە ماڵ. دایکی لە بەردەم هەیوانەکە خەریکی ئاگردانەکە بوو، شێوی لێدەنا. کە ئەمی بینی، بەرزەپا هەڵسایە سەر پێ، "وەی بەم درەنگوەختە لەکوێ بوویت." دەستی دایکی ماچ کرد و ئەویش باوەشێکی پیا کرد و بۆنی مێخەکەکانی ملی هات بە سەریدا.

ئێوارە هەمووان لەسەر سفرە جەم بوون. باوکی شانازیی پێوە دەکرد و لەناو گوندا بەردەوام باسی دەکرد، کە سبەی کوڕەکەی دەبێتە مەلا و دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکە و دەبێتە مەلای گوندەکە. ئیتر ئەم گوندە حەوجەی بە مەلای غەریبە نابێت. باوکی بێئاگا لەوەی هەرگیز کوڕەکەی نابێتە ئەو مەلایەی لەناو مزگەوتەکاندا ئامۆژگاریی خەڵک بکات و لەبریی ئامۆژگارییەکانی بەیانییان مەنجەڵەماستی بۆ ببەن و هاوینان زەکاتی بۆ کۆ بکەنەوە. ئەم دەبێتە مەلایەک لە هیچکام لە مەلاکانی سەردەمی خۆی و پاش خۆی ناچێت. مەلایەک، لەبریی ئەوەی دۆستی ئامۆژگاری بێت، دۆستی خەونی باڵدار و زمانی باڵدار و شەرابی هوشیاربوونەوەیە.

دوو-سێ جار ویستی باسی ئاگرەکەی ناخی بکات، شەرمی لە خۆی کرد. لای خۆی دای نابوو کە فەقێیەتیی تەواو کرد و ئیجازەی وەر گرت، یەکەم ئیشی ئەوە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەیان و داوای کچە ئەسمەر و

باریکەلەکەی ناو خەون و خەیاڵەکانی بکات. ئەوەی ئەو بیری لێ دەکردەوە، ئاشێک بوو، ئەوەشی هاتە بەردەمی، ئاشەوانێک بوو.

لەو ڕێگای غەریبییەدا خەیاڵی هەڵی پێچابوو بۆ سەردەمێک، کە سەردەمەکە تێپەڕیبوو. گەر یەکێک لە خزمەتکارەکانی قافڵەکە ڕای نەچڵەکاندایە، هەر بە خەیاڵ هەموو ئەو نەخشانەی بۆ ژیانی خۆی دای نابوو، ڕێکی دەکردنەوە و دەگەیشتن بە کچە ئەسمەرەکەی ناو خەونەکانی.

(بینابیم کوێرە هەڵنایە بە ڕووی کەس.)

# (٨٨)

**قافڵەکە لای دا.**

لە دوورەوە دەنگی کەڵەشێری ئاواییەک دەهات.

خزمەتکارانی قافڵەکە ڕێبوارەکانیان ئاگادار کردەوە، "لەم دەمەوبەیانە فێنکەدا، کە شەوەکەی بەڕێوە بووین و ماندوو بووین. تا پێتان دەکرێت لەم چەند کاتژمێرەدا بخەون و سبەی پێش خۆرهەڵهاتن خەبەرتان دەکەینەوە و دەکەوینە ڕێ. نالیی باڵدار زۆر ماندوو بوو. پێشووتر ئەو جۆرە ڕێگای دوورەی نەبڕیبوو. ڕێگای دووریشی بڕیبێت پێشووتر، ئەوسا تەمەنی وەک ئێستا بەرەو کزی نەدەچوو، تا ئەوەندە هەست بە هیلاکی بکات. لەگەڵ جێگەکەی داخست و چووە سەر جێگەکەی، خەوی لێ کەوت.

کچەی ئەسمەر و ژنەی کڵاوزێڕ پێکەوە هاتنە خەوی. هەردووکیان لەسەر کانییەکەی بەردەم گوندەکەی خۆیان بوون. بە دەست بانگیان کردە لای خۆیانەوە. ژنەی کڵاوزێڕ، کە پێشووتر هاتبوویە خەوی، ڕووی تێ کرد و بە ناز و عیشوەیەکەوە پێی وت، "ئەوەی لە خەونەکانتدا دەیبینی، هەر

ئەوەیە پێشووتر بیرت لێ کردووەتەوە. لەو شەوەی تۆ خەوت بە منەوە بینی، منیش خەوم بە تۆوە بینی. من ئەزانم جەرگت سووتاوە بۆ ئەم کچە ئەسمەرە نازدارە، ئەشزانم هەوای ئەم کچە وات لێ دەکات خەون بە کڵاوزێڕێکی وەک منەوە ببینیت."

لەناو قسەی کڵاوزێڕ، لە خەوەکەدا لە بەردەم کچەی ئەسمەردا وەک چۆلەکەی بەر باران هەڵدەلەرزی. تاوێ لە چاوە تیلەکانی کچەی ئەسمەری دەڕوانی و تاوێ لە لاملە زەردەکەی کڵاوزێڕ. کچەی ئەسمەر هیچی نەوت، تەنانەت یەک وشەش چییە نەیوت. تەنها بیستبووی فەقێیەک باسی کردووە و لە دوورەوە خۆشی دەوێت. ئیتر نە ڕۆژێک ئەو فەقێیە قسەیەکی لەگەڵ کرد، نە ڕۆژێک ژوانێکی لەگەڵ بەست. ژیان هات و چوو، فەقێکە بوو بە ئەستێرەیەکی گەورە. ئەو ئەستێرە گەورەیە برینەکەی گەنجیی خۆی ڕووناک کردەوە و کچەی ئەسمەری کرد بە ئەستێرەی ناو ئەستێرەکان.

لە خەونەکەیدا کڵاوزێڕ، نالیی باڵداری بە کچەی ئەسمەر دەناساند. کە چۆن بووە بە ساحێبی دیوان و چۆن بەرگریی لەجوانییەکەی ئەو کردووە و چۆن ئاگرەکەی ناخی خۆی کردووە بە بەیت و بەناو کوڕان و کچانی میرنشینەکەدا بڵاو بوونەتەوە. کچەی ئەسمەریش بەجوانی گوێی بۆ کڵاوزێڕ شل کردبوو، لە خۆشیدا چک چک پێکەنین لە لێوەکانییەوە دەچۆڕایە خوارەوە.

نالیی باڵدار لە بەردەمیاندا دۆش دامابوو، نەیدەزانی چی بڵێت و چۆن بەیانی خۆی بکات بۆ هەردووکیان. خەونەکەی هێندە خۆش بوو، بەڕاستییش ئەو دیمەنەی بدیبایە، هەر

هێندەی ئەو خەونە خۆشیی بە گیانی دەگەیاند. لەو ساتەوەی ویستی هەڵسێتە سەر پێ شتێک بە کچەی ئەسمەر بڵێت، دەستی یەکێک لە خزمەتکارەکانی قافڵەکە ڕای وەشاند و خەبەری کردەوە بۆ ڕۆیشتن.

لە ڕاستیدا دەیویست پێی بڵێت:

(شەقی کە، غەیری حوببی تۆی تێدا بێ

بە دەستی خۆت، دڵم دەربێنە قوربان.)

# (٨٩)

**گەیشتنە ئوستەنتینییە.**

شارێکی گەورە، ڕووبارێک شارەکەی بەش کردبوو.

کۆلانەکانی بە بەردی ورد چنرابوون، مزگەوتەکانی لە مزگەوتەکانی شوێنەکانی تر نەدەچوون، چەندین منارە و گومەزیان لەسەر بوو. کۆترەکان باشترین ماڵیان سەر منارە و گومەزەکان بوو، پشیلەکان حەوشەی مزگەوتەکانیان کردبوو بە شوێنی حەوانەوەیان. ئاوازی بانگدەرەکان ئاوازێکی خەمگین، درێژ، ئاوازێک، ڕێبوار و غەریبەکانی ناچار دەکرد یان بوەستن گوێی لێ بگرن، یان بەرەو دەرگای مزگەوتەکە بچنە ژوورەوە. خۆی کرد بە یەکێک لە مزگەوتەکاندا. ناوەوەی مزگەوتەکە پڕ بوو لە فەرشی ئاوریشمی کاشانی. دیوارەکانی مزگەوتەکە بە هەزاران تابلۆی جوان ڕازێنرابوونەوە. لەناو مزگەوتەکەدا سەرسامانە سەیری هەرچوار لای دەکرد.

مەلایەک هات و قۆڵی گرت، زانیی غەریبە. بە تورکییەکی بەخت کەوتە قسە لەگەڵی. باسی سەفەرەکەی خۆی و

دووریی نیشتمانی بۆ کرد.

(نیشتمان برینێکی سارێژنەبووە لای کەسی غەریبە.)

مەلای مزگەوتەکە بردیە هۆدەکەی خۆی و نانوچایەکی پێ دا. ئەویش خەمی کەرەکەی بوو. مەلا دڵنیاییی پێ دا شوێنی ئەویش خۆش دەبێت و خەمی نەخوات، داواشی لێ کرد هەتا لەم شارەیە، بێتە ئەم مزگەوتەوە و بە ماڵی خۆی بزانێت. داوەتەکەی مەلای پێ خۆش بوو. بەشوێن خانەقایەکدا دەگەڕا، کە پێشووتر لەم شارە دروست کرابوو. مەلا خانەقاکەی پێشان دا، کە لەوبەری ئاوەوەیە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی شارەکە. بۆ ڕۆژی دوایی چوو بۆ خانەقاکە و لەوێ شاد بوو بە کۆمەڵێک مەلا، کە پێشووتر لە سەردەمی فەقێیەتیدا، لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی تووران پێکەوە خوێندبوویان. لای ئەوان مایەوە و لە هۆدەکانی خۆیان شوێنێکیان بۆ تەرخان کرد. ئەوانیش بیستبوویان بووە بە شاعیرێکی گەورە و زمانەکەی خۆی کردووە بە بناغەیەک بۆ میرنشینێک. ئیتر هەریەکە لای خۆیەوە پرسیاری لێ دەکرد تا بزانن چۆن ئەم کارەی کردووە. ئەویش بەم برینە زۆرانەوە باسی کارەکەی دەکرد و هەرگیزاوهەرگیزیش ڕۆژێک لە ڕۆژان باسی ئەوەی نەکرد لەدەست ئەو خەڵکە هەڵهاتووە، کە زمانەکەیانی بۆ کردوون بە زمانی نووسین و میرنشینەکە.

قاچەکانی ئێشیان دەکرد، نێوان پەنجەی قاچەکانی بووبوون بە برین. بەو حاڵەشەوە بە ڕۆژدا بەناو شارەکەدا دەگەڕا و ئێوارانیش سەرێکی لە کەنارە ئاوییەکە دەدا و سەیری ئاوابوونی خۆری دەکرد. کە تاریکییش دەهات، دەگەڕایەوە بۆ خانەقاکە بۆ لای هاوڕێکانی و شەوانیش خەریکی نووسین

و خوێندنەوە بوو. لەو ماوەیەدا نوێژی نەکرد و کەسیشیان نەیانپرسی بۆ نوێژ ناکات. تەریقەتەکەیان وا فێری کردبوون نەچنە ناو ژیانی تایبەتیی هیچکەسەوە و خۆیان بکەن بە پاسەوانی ژیان. ئەو هەستی غەریبی و ئازارەی لە ناخیدا بوو، ڕۆژبەڕۆژ گەورەتر دەبوو. بۆ سارێژبوونەوەی دەینووسی. نووسین بووە دەرمانی برینەکانی.

(نەمردم من ئەگەر ئەم جارە بێ تۆ
نەچم شەرت بێ هەتا ئەم خوارە بێ تۆ.)

# (٩٠)

**وێنەی شارەکە لە خەیاڵی دەر نەدەچوو.**

بە ڕۆژدا کەمێک سەرقاڵ دەبوو، لە شەودا حاڵی باشتر بوو.

شەوان نیشتمان خەیاڵ و هۆشی داگیر دەکرد. ئەو شارەی زۆرترین ئازاریان دا، لە غەریبیدا بیری دەکرد. بیری هەمووشتێکی دەکرد، تەنانەت بیری ئەو شاعیر و مەلا و کوێخایانەی گەلەکۆمەیان لێ دەکرد و نەفرەتیان دەکرد. ئێستا لە یەکێک لە کۆڵانەکانی قوستەنتینییە ئەو مەلایەی بدیبایە لەسەر دەستنووسی عارفەکە قۆڵی ڕاکێشا و شکاتی لێ کرد، باوەشی پێدا دەکرد و دەیهێنایەوە بۆ لای خۆی.

بیری سالمی پەنجەشینی دەکرد، لە خۆی دەپرسی، دەبێت ئێستا چی بکات. چەند بە دۆستێکی بێڕەحمم بزانێت ئاوا بێ چرپە، بێ خواحافیزی جێم هێشت. ئەبێت ئێستا کڕیاری هەبێت یان نا. نیوەڕۆیان لەناو کتێبخانەکەیدا چۆن باسم بکات و کاتێک شیعرێکم دەنووسێتەوە، ڕوخساری من بێتەوە خەیاڵی.

بیری ئەو ساتانەی دەکردەوە کە پێکەوە لە گۆشەی دەرگاکەوە سەیری ئەو دوو دەنگخۆشەیان دەکرد کە شیعرەکانیان دەخوێندەوە و دەستی خۆیان ڕادەوەشاند و بە ئاواز وشەکانیان خۆش دەکرد بۆ گوێگرتن.

بیری ئەو ئێوارانەی دەکرد، کە بەقاڵەکان بە خۆیان و ورگە زلەکانیانەوە دەسرە ئاوریشمەکانیان تەڕ دەکرد و دەیانکێشا بە پشتەملی پیازە تەڕەکاندا و شەقەی هەڵدەستدا و بۆنێکی تەڕی بەو ناوەدا بڵاو دەکردەوە.

هەموو ئەو شتانەی لەو ماوەیەدا بینیبوونی، بیری دەهاتنەوە. کوخەکەی و چەندین ساڵ دووری لە مرۆڤ، گەنجێتی و ئێوارانی ماڵی خۆیان، هەواڵی هاتنی مەرگی باوکی و گریانە زۆرەکەی ئەو شەوەی، هەواڵی هاتنی مەرگی دایکی و وشکبوونی لێوەکانی و نائومێدبوونی لەو قسانەی دایکی، کە دەیگوت، "یەک زەماوەندت بۆ دەکەم، هەموو خەڵکی گوند تێیدا هەڵپەڕن."

(لە غەریبیدا بیری شتانێک دەکەیت، کە هەرگیز بڕوا ناکەیت بیریان بکەیت.)

سالمی پەنجەشین بە خۆی و ڕوخسارە باریکەکەیەوە لە بەرچاوی لا نەدەچوو. ئەمەی کردە بیانوویەک و نامەیەکی بۆ نارد، لەناو نامەکەدا بە چامەیەکی درێژ هەواڵی خۆی و هەموو ئەو شوێنانەی پرسیبوو، کە کاتی خۆی پێکەوە لەناو شارەکەدا بینیبوویان. نامەکەی برد بۆ بازاڕی قافڵەی میرنشینە کوردەکان و لە ڕێگەی کەسێکەوە بۆی ناردەوە.

لەناو چامەکەدا بەوردی باسی میرنشینەکە و شارەکەی کردبوو. بەوردی هەواڵی دانەبەدانەی شوێنەکانی پرسیبوو.

دوای گەیشتنی نامەکەی، چامەکەی بوویە هەڵلایەک و بە سەرسەرجەم میرنشینەکەدا بڵاو بووەوە. چامەکەشی بەم شێوەیە دەستی پێ کردبوو.

(قوربانی تۆزی ڕێگەتم... وەی پەیکی شارەزا...)

# (٩١)

**پەیکەکە گەیشت.**

لەناو دوکانەکە کۆمەڵێک بەرگی ڕەقی دروست کردبوو.

بەرگەکان شین شین بوون. دەیویست سەرلەنوێ دیوانەکە بنووسێتەوە و لە چوارچێوەی بەرگێکی شیندا، کە گوڵینگەیەکی سوور و زەنگێک بە گوڵینگەکەوە نیگار کرابوون، بڵاو بکاتەوە. خۆیشی ماوەیەکی زۆر بەجوانی نووسیبوویەوە، هەندێک وردەکاریی مابوو، دەبا وردەکارییەکان چاک بکات و بەم بەرگە نوێیەوە دەست بکاتەوە بە بڵاوکردنەوەی.

دەزوییەک بە دەستیەوە بوو، خەریکی کونکردنی بەشی خوارەوەی بەرگەکان بوو. کەسێکی غەریب خۆی کرد بە دوکانەکەیدا. بە ڕوخساری کەسەکەدا دیار بوو خەڵکی شارەکە نییە. دوای سڵاو و چۆنی و چاکی، کەسە غەریبەکە بۆ دڵنیابوون سەیرێکی ناو دوکانەکەی کرد. ئەمیش وای زانی بەشوێن کتێبێک یان دەستنووسێکدا دەگەڕێت، پێی وت، "فەرموو چیت دەوێت، با لە خزمەتتدا بم."

کەسەکە سوپاسگوزاریی خۆی پیشان دا و پاشان لێی

پرسی، "تۆ سالمی پەنجەشینی؟"

ئەویش دەستەکانی بەرز کردەوە، پڕ بوون لە مەرەکەبی شین، بەپێکەنینەوە وتی، "بەڵێ ئەوم، نابینی پەنجەکانم شین شینن. ئیشەکەی من ژیانە لەناو مەرەکەب و نووسیندا. ئەم مەرەکەب و نووسینە وایان لێ کردم خەڵک بەو ناوەوە بانگم بکەن. ئەمر بکە با لە خزمەتتدا بم."

ڕێبوارەکە توورەکەیەکی بەجاجمدردوستکراو لە ملیدا بوو. دەستی برد لەناو توورەکەکە نامەیەکی دەر هێنا و خستیە بەردەمی. "ئەم نامەیەم لای دۆستێکی خۆتەوە بۆ هێناوی. دۆستەکەت حاڵی باشە و ئەم ناوونیشانەی دا بە من. پێی وتم بەئامانەت بیگەیەنمە دەستت و سڵاو و ڕێزێکی زۆریشی هەبوو بۆت."

نامەکەی لێ وەر گرت و خولقی کرد دانیشێت چایەک بخۆن. ڕێبوارەکە درەنگی بوو و دەبایە بڕوات. ئەو ڕۆیشت و ئەمیش نامەکەی کردەوە.

وای خودایە، خۆ ئەوە نامەی نالیی باڵدارە. نامەکە دوو بەش بوو، بەشێک هەواڵپرسینی خۆی و کچەی شێخی ژنی و بەشێکیشی چامەیەکی دوورودرێژ بوو. بە خوێندنەوەی چامەکە لە شوێنی خۆی سڕ بوو. دەستی لە بەرگەکان هەڵگرت و تا دەمەوئێوارە چەندین جار خوێندیەوە. بیری لەوە کردەوە بۆ سبەی بە زووترین کات بینووسێتەوە و بڵاوی بکاتەوە. بیری لە چی کردەوە، وای کرد. سبەی بازاڕ بوو بە بازاڕی چامە نوێیەکە. چامەکە چەند دەنگی دایەوە، هێندەش ناوی سالمی پەنجەشین لەگەڵیدا دەنگی دایەوە.

ئێوارە بەدەم گۆرانیوتنەوە خۆی کرد بە ماڵدا. لە

دوورەوە بە ژنەکەی وت، بۆنخۆش گیان، ئەوە نامەی نالیی باڵدارە، دانیشە با بۆت بخوێنمەوە. تا نیوەشەوێک نامە و چامەکەی یەک لەسەر یەک دەخوێندەوە. بەیانییەکەشی کەوتە ئیشکردن و بڵاوکردنەوەی.

کەسیش نەبوو بڕوات بۆ ئەو شارەی ئەوی لێیە، بۆیە بە حەسرەتی وەڵامدانەوەی گوێقولاغی قافڵەیەک بوو.

(دوورکەوتنەوەی دۆستێکی ئازیز، دوورکەوتنەوەی بەشێک لە خۆتە.)

## (٩٣)

**دەبایە هونەری خۆی دەر بخات.**

چەندین ساڵە لەناو وشە و مەرەکەبدا دەژێت.

لە دوورەوە بۆنی وشە و مەرەکەبی دەدا. ئەم هەموو کتێبەی بە پەنجە درێژەکانی خۆی نووسیبوویەوە. لە چامەکەشدا ناوی هاتبوو، خەیاڵی دەرخستنی هونەری خۆی دای لە سەری. ئەو بەیانییەی دۆستەکەی بەبێدەنگی ڕۆیشتبوو، لەسەر گۆزەیەک دوو ڕستەی جێ هێشتبوو، لەو بەیانییەوە دەرگای هۆدەکەی داخستبوو، نەیهێشتبوو دەست لە هیچ شتێک بدرێت. بەردەوام چاوەڕوانی دەکرد ڕۆژێک بێت بگەڕێتەوە. ڕۆیشتە هۆدەکە، لەسەر جێگەکەی ئەو دانیشت و چراکەی داگیرساند و پاڵی دایەوە بە بالیفەکەوە. قامیش و تیانووسەکان لە شوێنی خۆیان دانرابوون. قامیش و تیانووسەکانی ئەوی ڕاکێشایە بەردەمی خۆی و دەستی کرد بە بیرکردنەوەی و وەڵامدانەوەی چامەکە. سێ ڕۆژ و سێ شەو لە هۆدەکە نەهاتە دەرەوە.

وەڵامێکی پوختی بۆ نووسی. هەرکەسێک وەڵامەکەی

بدیبایە، ڕاستەوخۆ دەیزانی لەژێر سێبەری چامەکەدا نووسراوە. یەکەم کەس وەڵامەکەی بۆ خوێندنەوە، ژنەکەی خۆی بوو. کە تەواوی کرد، هاواری لێ کرد بێتە ژوور. ئەویش هات و خۆی ئاسا وتی، "بۆنخۆش گیان، باش گوێ بگرە، بزانە هونەری پیاوەکەت چۆنە. وەڵامی چامەکەم داوەتەوە." کە بۆی خوێندەوە، ژنەکەی هەڵسا یەواشێک پەنجە شینە مەرەکەباوییەکانی ماچ کرد و بەدڵنیابوونەوە پێی وتم، "ئیتر کاتی تۆیە، کاتی تۆیە نەهێڵی ڕێگای دۆستەکەت ون بێت. دڵنیام گەر بزانێت ئەمەت کردووە، خۆشحاڵ دەبێت."

داخی بوو هیچکەس نییە تا وەڵامی پەیکەکەی بۆ بنێرێتەوە. شەو هاتە خەوی. نالیی باڵدار بە دوو باڵی سپیی گەورەوە لەسەر دارتووی حەوشەکە نیشتبوویەوە. چووە ژێر دارتووەکە و وەڵامەکانی دایە دەستی. خوێندیەوە و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و دای لە شەقەی باڵ و ڕۆیشت. هەر ئەو شەوەی ئەم لێرە خەونی پێوە دیبوو، ئەویش لەوێ خەونی بەمەوە دیبوو، تەواوی وەڵامەکەی خوێندبوویەوە. دوو دۆست بوون، دووری نەیدەتوانی لەیەکیان بکات. سنوورەکان و میرنشینەکان هەرچەند دوور بوونایە، ئەمان خەون بەیەکی دەگەیاندن.

چۆن چامەکەی بڵاو کردەوە، بەشوێنیشیدا وەڵامەکەی بڵاو کردەوە. خەڵکێکی زۆر لە دیوەخاننشینەکان و مەجلیسی شار ستاییشی وەڵامدانەوەکەیان کرد. ئەویش ئەمەی بە هەل زانی و لەپاڵ کارەکەی خۆیدا، دەستی کرد بە نووسین. ناوی وەک شاعیرێکی دوای نالیی باڵدار بڵاو بوویەوە. کەسانێک هەبوون دەیانگوت، "باڵدارێک هات هێلانەکەی

دورست کرد و دوای خۆی ئەو هێلانەیە بوو بە شوێنی چەندین باڵداری تر و یەک لەدوای یەک بەردەوامییان بە هێشتنەوە و گەورەکردنی هێلانەکە دا."

(گیانم فیدات... لە هەموو ڕاهی پڕ خەتەر...)

## (٩٣)

**مەجلیس گەرم بوو.**

میری گەورە و جێگرەکەی بەبێدەنگی لە سەرەوە دانیشتبوون.

لەناکاو یەکێک لەو شاعیرە کۆنانەی ناو دیوەخانەکان، کە کاتی خۆی سەرپەرشتیی هەڵمەتی ئازاردانەکەی دەکرد، بێدەنگییەکەی شکاند و کەوتە سەرزەرنشتکردنی خۆی و دەوروبەرەکەی. لای کەسیان ئەو سەرزەنشتکردنە جێگای سەرسوورمان نەبوو. ئەوان تا پێیان کرا، شەڕی خۆیان کرد. تا پێیان کرا، بەرگرییان لە نەریتە کۆنەکەی خۆیان کرد. کە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا و میریش ناچار بوو زمانەکەی بگۆڕێت، لێرەولەوێ سەرزەنشتی خۆیان دەکرد، کە بۆچی نەیانتوانی ڕێگری بکەن. بەس ئەمە یەکەم جار بوو لەناو کۆشکی میردا بکەونە سەرزەنشتی خۆیان. شاعیرەی سەرزلی غەبغەبەلەمل، بەڕاشکاوی پەشیمانبوونەوەی خۆی دەر خست.

کاتێک ئەو دەستی کرد بە پەشیمانبوونەوە، بەدوای

خۆیدا یەک لەدوای یەک پەشیمان دەبوونەوە. سالمی پەنجەشینیش لە گۆشەیەکەوە دانیشتبوو و گوێی دەگرت. کە ئەوان پەشیمان بوونەوە لەو کردەوانەی نواندبوویان، لێیان هاتە دەنگ و پێی وتن، "ئەی بۆچی پێکەوە نامەیەک بۆ نالیی باڵدار نانووسن بگەڕێتەوە شارەکەی خۆی؟ گەر ترستان لەوە بێت لەناو دیوەخانەکاندا شوێنتان بگرێت، ئەو ئەهلی دیوەخان نییە." قسەکەشی ڕاست بوو. ئەما کەسیان نەچووە ژێر باری ئەوەی نامەی گەڕانەوەی بۆ بنووسن، تەنها پەشیمان بوون لەوەی نەدەبا بەو جۆرە ئازاری بدەن.

سەرلەنوێ دیوانەکەی بە بەرگێکی شینەوە بڵاو کرایەوە و چامەکەشی تێدا دانابوو. لەپاڵ ئەودا، بەیتە شیعرییەکانی سالمی پەنجەشینیش بڵاو دەکرانەوە. بوو بە نەریت و گەنجان و فەقێکان چاویان لێ کردن و دەستیان کرد بە نووسین بەو زمانە تازەیە. کتێبە کۆنەکانی ناو کتێبخانەکەی تۆزیان لەسەر نیشتبوو. زۆر گرنگیی پێ نەدەدان و زیاتر لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەوەدا بوو خۆیشی ببێتە خاوەنی دیوان. لەناو میرنشینەکەشدا شوێنێکی باشیان پێ دابوو، کەمتر لە جاران خەریکی بنووسی بوو. پەنجە شینەکانی شینییەکەیان تۆزێک کاڵ بووبوویەوە. ڕۆژانە چەند کاتژمێرێک دەهاتە دوکانەکەی. ئەوەی زۆر خۆشحاڵی دەکرد، بووبووە کۆڵەکەی دووەمی خەونی دۆستەکەی. ئەو لە غەریبیدا کەس نەیدەزانی بە چییەوە خەریکە و کەسیش نەبوو هەواڵی بهێنێت. تا دواساتەکانیش، نەزانرا ئەو ماوەیە لە غەریبیدا چیی کردووە.

(دەستکاریی دونیاکە بکە و چاوەڕوانی هیچ مەکە.)

## (٩٤)

**میری گەورەی گریاند.**

جێگری میر گێڕابوویەوە، بە چاوی خۆی گریانەکەی دیوە.

ئەو ڕۆژەی چامەکەی بڵاو کرابووەوە، جێگری میر دەستنووسێکی بۆ بردبوو، ئەویش لەسەر کورسییە تەختە بە دارگوێز دروستکراوەکەی پاڵی دابووەوە و بەچرپە دەستی کردبوو بە خوێندنەوەی. هێشتا نیوەی چامەکەی تەواو نەکردبوو، چاوەکانی تەڕ بووبوون. کاتێ گەیشتبوویە سەر باسی شوێنەکانی شارەکە، خۆی نەگرتبوو و فرمێسک هۆن هۆن هاتبوونە خوارەوە.

دوای تەواوکردنی چامەکە و وەستانی فرمێسکەکانی چاوی، داوای لە جێگرەکەی کردبوو ئەم چامەیە بەدیاری بداتە ئەو، تا لەسەر پێستی ئاسک بینووسێتەوە و لە دیوەخانی گەورەی کۆشک هەڵی بواسێت. ئەویش بەخۆچەماندنەوە داواکەی قبوڵ کردبوو.

ڕووی کردبووە جێگرەکەی و پێی وتبوو، "تۆ لە من

باشتر دەتناسی، من ئازاری زۆرم دا. لە سەرەتادا نەمدەزانی ئەم باڵندە غەریبە کە هاتووە بۆ ئەم شارە دەیەوێت چی بکات. ئێستا دوای ئەوەی ڕۆیشت، تێگەیشتم دەیویست چی بکات. لە هەموو حاڵەتێکدا میرێکی باش نەبووم. میرێکی باش بوومایە، نەمدەهێشت زێڕێک لە شارەکە بڕوات و وردەبەرد لە شوێنی ئەو دانیشن. ئەم شاعیرانەی دەربار زمانێکی فریودەریان هەیە. شاعیرەکان بۆیە ترسناکن، چونکە زمانێک شک دەبەن، ئەو زمانە هەموو کەس ناتوانێت هەیبێت. بەس تازە پەشیمانی دادی کەس نادات."

جێگرەکەی دڵنەواییی کردبوو و پێی وتبوو، "ئێستاش دەتوانی ڕێزی بگریت. تۆ لەو ڕۆژەوەی بڕیارت دا زمانەکەی ئەو بکەیتە زمانی میرنشینەکە، خۆی ڕێزگرتن بوو لە ئەو. بەس ئەو چونکە پیاوێکی گەڕیدەیە و هیچ شوێنێک ناتوانێت پەڕوباڵی بکات، ڕێزگرتنەکەی تۆ ڕای نەگرت و ڕۆیشت. کاتی خۆیشی زۆرم وت بەو جۆرە مەبە لەگەڵی، ئێستاش دەڵێم گرنگی بە کارەکانی بدە. کێ خودا دەیداتێ کەسێک بێتە میرنشینەکەی و دونیایەکی بۆ بگۆڕێت بۆ دونیایەکی تر؟ ئەمە شانسی تۆیە."

میر سەری ڕەزامەندیی ڕاوەشاندبوو.

پاش ڕۆیشتنی، خۆی بەو هەموو ئازارەوە کەوتنە ستاییشکردنی و پەشیمانبوونەوە. هەتا لێرە بوو، لە سەد لاوە تیریان تێ دەگرت. خەڵکی ئەم سەردەمە زۆر سەیرن، تا نزیکتر بیت لێیان، زیاتر خەنجەرت لێ دەدەن. کە دوور کەوتیتەوە، ئەوسا ڕووناکییەکەت دەبینن و پەشیمان دەبنەوە.

گریانەکەی میر جێگرەکەی بۆ کۆمەڵێک نووسەر و

شاعیری دیوەخانشینی گێرابوویەوە، ئەوانیش لەناو خەڵکدا باسیان کردبوو و دەماودەم گەیشتبوویە تەواوی شارەکە. ژنان ئێواران لە بەردەرگا دادەنیشتن و باسی فرمێسکە قورسەکانی میریان دەکرد کە چۆن لەبەر قورسییان بەهێواشی لە چاوانییەوە بەر بوونەتە خوارەوە.

## (٩٥)

**شارەکە زۆر گەورە بوو.**

هەرچوار دەوری ئاو بوو. لە ناوەڕاستیشدا ڕووبارێک کردبووی بە دوو بەشەوە.

ماسیگرەکان بە خۆیان و قولاپەکانیانەوە لەسەر بەردێک دادەنیشتن و ماسییان دەگرد. هەندێکیشیان پیر بوون، پیرەکان ئێواران دەڕۆیشتن بۆ ماسیگرتن و گۆزەیەک شەرابیشیان لەگەڵ خۆیان دەبرد. نالیی باڵدار ئێوارەیەک پێش خۆرنشین، بەکەنار ڕوبارەکەدا پیاسەی دەکرد. دوو پیر دانیشتبوون ئاگریان کردبوویەوە و دەستیان ڕاوەشاند و بانگیان کرد بۆ لای خۆیان. ڕۆیشتە لایانەوە ماسییان خستبوویە سەر سکڵەکە و وردەوردە شەرابیان دەخواردەوە و کە ماسییەک دەبرژا، لەگەڵ شەرابەکە دەیانخوارد.

دانیشت لەگەڵیان و دەستی کرد بە شەراب و ماسی خواردن. پیرەکان زۆر قشت و قسەخۆش بوون. باسی سەرسەرێتیی گەنجێتیی خۆیان دەکرد، کە لەم شارە چییان کردوە. دوو کەس بوون لەو کەسانە لە گەنجیدا هەرچیی

چێژفرۆشی ئەم شارە هەیە تاقییان کردبوویەوە. حەزیان کردبوو بە ژیانێکی ئازادانە بژین. یەکێکیشیان تا ئەو تەمەنە ژنی نەهێنابوو، بڕوای بە هاوسەرگیری نەبوو. زوو زوو بەدەم شەرابخواردنەوەوە دەیگوت، "ئازیز، ژن دەبێت هاوڕێت بێت، نەک ژنت بێت."

نالیی باڵداریش دڵی بۆ خۆی دەمایەوە کە هیچ لەو شتانەی نەدیبوو کە ئەوان باسیان دەکرد. لە هەموو ژیانیشیدا دوو جار لە نزیکەوە ژنی دیبوو، ئەویش لە خەونیدا. ئەما وەک ئەوان بیری نەدەکردەوە و بەئاواتەوە بوو بۆ ساتێکیش بێت کچە ئەسمەرە باریکەلەکە ببێتە هیی خۆی.

خەریک بوو سەری گەرم دابێت، سەرگەرمییەکەی پەیوەندیی بە ساتە خۆشەکە و کەناری دەریاکەوە بوو. لەکەنار دەریا، مەستی مەستترت دەکات. هێندەی دانیشتنەکەی پێ خۆش بوو، تا ئەوان هەڵنەسان بەلارەلار بڕۆنەوە بەرەو ماڵ، ئەمیش شوێنەکەی جێ نەهێشت. دوای ئەوە فێر بوو مێزەرەکەی فڕێ بدا و کەواکەش لەگەڵی. بە جلی شارنشینەکانەوە ئێواران گۆزەیەک شەراب و قولاپێک ماسی بە دەستیەوە بەرەو کەناری ئاوەکە دەڕۆیشت. بەم بۆنەیەوە چەندین پیر و چەندین چیرۆکی نوێی ناسی و گوێی لە بەسەرهاتی سەیرسەیر دەبوو. شەوانیش درەنگێک بە سەرێکی پڕ لە ئاژاوە و سینەیەکی پڕ لە برینەوە دەگەڕایەوە بۆ لای دۆستەکانی و خەریکی نووسین و خوێندنەوە دەبوو.

یەکێک لە باشییەکانی ئەوە بوو، ئەوەندە شەرابی نەدەنۆشی کە حاڵی تێک بچێت. عادەتە کۆنەکەی خۆی لەبیر

نەکرد و برینە گەورەکانیشی نەیانتوانی وای لێ بکەن ببێتە پیاوێکی مەست.

(ژیان خۆی مەیخانەیەکی گەورەیە.)

# (٩٦)

**توورەکەکەی گۆڕی.**

بەناو بازاڕەکەدا ڕۆیشت، ئیدی شەرابی نەمابوو.

توورەکە پارەکەی بردە لای باجگرێک و داوای لێ کرد بیکات بە پارەی ئەم شارە. ئەویش کەمێک باجی لێ هەلگرت و پارەکەی بۆ گۆڕییەوە. بیری لەوە دەکردەوە ئیشێک بدۆزێتەوە و شوێنێک بگرێت بۆ خۆی. ئەو ڕۆژە تا درەنگانێک بەشوێن ئیشدا گەڕا، نائومێد بوو، ئیشی دەست نەکەوت و لە بەردەم دوکانێکی گوڵفرۆشدا دانیشت، تا ماندوویێتیی بحەوێتەوە. خاوەنی دوکانەکە پیرەمێردێکی باخەوان بوو، هاتە لایەوە و لێی پرسی، "غەریبەیت؟" ئەمیش بە ملەکاندنێکەوە وەڵامی دایەوە. خاوەندوکانەکە سەیرێکی سەروسیمای کرد و پێی وت، "حەز دەکەی لای من ئیش بکەیت." بەم پرسیارە ماندوویێتیی نەما و لە خۆشییا هەڵسایە سەر پێ و بە دەست و دەم و قاچ بەڵێنی بۆ کرد.

بردیە ژوورەوە. ڕۆژانەکەی زۆر نەبوو. هۆدەیەک هەبوو لە پشتەوەی دوکانەکە، هۆدەکەی پیشان دا و نرخ و

شێوەی گوڵەکانی پێ ناساند. بەگاڵتەشەوە وتی، "گوڵفرۆش وەک هەنگ و شاعیر وایە، هەمیشە بەشوێن جوانییەکاندا دەگەڕێت." نەیدەزانی ئەوەی کردوویەتی بە بەردەستی خۆی، چ هەنگێکی شاعیرە.

کەرەکەی هێنا و بارگەوبنەی خۆی پێچایەوە و لە شارە گەورەکە بوو بە گوڵفرۆش. بەیانییان کەرەکەی دەبرد بۆ ئەو قەدپاڵەی چەند گردێک لە گوڵفرۆشییەکەوە دوور بوو، تا دەمەوئێوارە خۆیشی وەک هەنگێک بەدەوری گوڵەکاندا دەسووڕایەوە و خزمەتی دەکردن و بە کڕیارەکانی دەفرۆشتن. ئێوارانیش بە گۆزە شەرابەکەیەوە بەرەو کەناری ئاوەکە دەڕۆیشت و شەوانیش بەدیار قوتیلەی چراکەوە خەریکی نووسین دەبوو.

ئەو بڕەپارەیەی پەیدای دەکرد، لە خۆیدا خەرجی دەکردەوە. نالیی باڵدار بوو بە هەنگی ناو گوڵەکان. گوڵە سوورەکانی لە پێشی پێشەوەی دوکانەکە دادەنا. دەیگوت، "گوڵی سوور چاوی مرۆڤ پێی ناوێرێت." خاوەنی دوکانەکەش کەیفخۆش بوو گوڵفرۆشێکی بەسەلیقەی دەست کەوتووە.

ژیانی باڵندەکە لە غەریبیدا لە ژیانی هەنگێک دەچوو لەناو شارێکی پڕ لە گوڵدا. ئازارەکەی سینەی و خەمباریی نیشتمان بووبووە سێبەری و لێی نەدەبوویەوە. ئەو ماوەیە هەرچیی نووسی، لەناو نووسینەکانیدا باسی لەو ئازار و غەریبییە دەکرد. چەندێکیش چاوی گێڕا یەکێک بدۆزێتەوە بەرەو نیشتمان بگەڕێتەوە، کەسی نەبینی. حەزی دەکرد ئەو کۆمەڵە نووسینە نوێیەی بە پەیکێکدا بنێرێتەوە بۆ نیشتمان

و سالمی پەنجەشین بە دەست و پەنجە نازدارەکانی خۆی بۆی بنووسێتەوە و بەناو میرنشینەکەدا بۆی بڵاو بکاتەوە.

لەم ئاخرییەوە خەمی گەورەی تەنها ئەو دەستنووسانە بوون و دەترسا شتێکی لێ بقەومێت بفەوتێن و ئەو لەتەی ژیانی لەم غەریبییەوە ون بێت.

(من لە خۆم ناترسم ون بم، لەوە دەترسم خەونەکانم ون بن.)

## (٩٧)

**نەیتوانی لە شوێنی خۆی هەڵسێتەوە.**

خاوەندوکانەکە هات بینی، دوکانەکەی نەکراوەتەوە!

دەرگای دوکانەکەی کردەوە و بانگی کرد، نالیی باڵدار... نالیی باڵدار...

ئەو بە نوزەیەک لە هۆدەکەی خۆی جوابی دایەوە. دەنگی دەر نەدەهات و خاوەندوکانەکەی گوێی لێ نەبوو. دەستی برد بۆ سندوقی دوکانەکە، بینیی پارەکان لە شوێنی خۆیاندان. گومانی لەوە نەما کە نەڕۆیشتووە و دەترسا ڕۆشتبێت و پارەکانی بردبێت. کە پەردەی هۆدەکەی لا دا، بینیی لە شوێنەکەی خۆی کەوتووە. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە، ئارەقە تەواوی گیانی خوساندوە. بەپەلە جامێک ئاوی بۆ هێنا و دەست و دەموچاوی تەڕ کرد و سەری بەرز کردەوە و تۆزێک ئاوی پێ دا. لێی پرسی چیتە؟ بە نووزەیەک، کە باش نەدەبیسترا، باسی ئازاری خۆی کرد. دەستی برد بۆ سینەی و وتی، "ئێرەم ئازاری هەیە. ئازارێک، کە گەورەترە لە نیشتمانەکەم."

خاوەندوکانەکەی دەستی لە گوڵەکان نەدا و ڕۆیشت بۆ لای ئەو حەکیمەی ماڵیان چەند گەڕەکێک لەودیو گوڵفرۆشییەکەوە بوو. ئازارەکەی پێ وت و ئەویش لە ڕەچەتەیەکدا دەرمانەکانی بۆ نووسی. ڕەچەتەکەی پێ دا و ئارەقەکەی وشک بوویەوە. ڕەنگە زەردەکە لە شوێنی خۆی مایەوە و وای زانی خۆراکی نەخواردووە بۆیە ڕەنگی زەرد بووە. خواردەمەنیی بۆ ئامادە کرد و کە دەستی کرد بە خواردن، چی خواردبوو، هەمووی هەڵهێنایەوە.

خاوەندوکانەکە دەرکی بە نەخۆشییەکی خراپ کرد. چەند جارێک لێی پرسی لەم دەوروبەرە شتی خراپت نەخواردووە، ئەویش بە ڕەنگێکی زەرد و بێهێزییەوە ملی بۆ ڕاوەشاند، کە هیچی نەخواردووە. لە شوێنەکەی خۆی پاڵی خست و بەنیاز بوو بچێت بەشوێن حەکیمەکەدا، کۆمەڵێک دەستنووسی بینی. سەیرێکی دەستنووسەکانی کرد بە پیتی عەرەبی نووسرابوون، سەری سووڕ ما. تا ئەو ساتەی دەستنووسەکانی نەبینی، نەیزانی ئەوەی لای ئەو کار دەکات، یەکێکە لە شاعیرە باشەکانی میرنشینێک.

دەستنووسەکانی بەدەستەوە بوو. بە دەستەکەی تری سەری بەرز کردەوە و پیشانی دان و پێی وت، "ئەمانە هیی خۆتن؟" بەڵام ئەو هێندە لاواز بووبوو، نەک سەری، تەنانەت نەیدەتوانی لێویشی بجووڵێنێت. هێزی دایە بەر خۆی دوو جار لەسەر یەک چاوەکانی کردەوە و دای خست، تا پێی بڵێ بەڵێ هیی منن.

خاوەنی دوکانەکە بەدەم قسەکردنەوە هۆدەکەی جێ هێشت. سەرکۆنەی خۆی دەکرد کەسێکی خوێندەوار لە

بندەستیدا بووە و پێی نەزانیوە و گومانی لێ کرد دەستی بۆ سندوقی پارەکە بردبێت، هێندە بەتوندی سەرکۆنەی خۆی کرد، بە دەنگی بەرز دەیگوت، "لە خۆم نابورم، نا، لە خۆم نابورم. چۆن دەبێت من گومانی وا بکەم." بەپرتاو لە دوکانەکە چووە دەرەوەی و بەرەو ماڵی حەکیمەکە هەنگاوی خێرای دەنا.

(کە مەرگ نزیک بوویەوە، ژیان فریا ناکەوێت خۆی کۆ بکاتەوە.)

## (٩٨)

**لە تاقی هۆدەکەوە ڕووناکی هاتبوویە ژوور.**

ڕەنگی لەبریی ئەوەی ڕەش هەڵگەڕێت، سپی سپی هەڵگەڕابوو. بە جۆرێک ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو، لەگەڵ ئەو کەمە ڕووناکییەی لە تاقی بنمیچەکەوە دەهاتە ژور، ژورەکەی ڕووناک کردبوویەوە. کە حەکیمەکە هاتە ژورەوە و بینیی، لە شوێنیی خۆی چاوی زەق کردەوە و بە خاوەنی دوکانی گوڵفرۆشەکەی وت، "ئەمە چییە؟ ئەمە تۆپەڵەبەفرە یان مرۆڤ." خاوەنی دوکانی گوڵفرۆشەکە بینیی بەو خێراییە ڕەنگی سپی سپی هەڵگەڕاوە و سپێتییەکەی ئاوی چاو دەبات و ژوورەکەی ڕووناک کردووەتەوە، ترسێک دڵی داخورپاند.

دەمارەکانی لەژێر پێستەکەیەوە دیار بوون خوێنیان پێدا دەڕوات. تووکە سپییەکان لە سپێتیی پێستێدا ون بووبوون. حەکیمەکە نەیدەوێرا دەستی لێ بدا، دەترسا هەڵوەرێت. هەتا دڵ حەزی دەکرد جوان بوو. لە پەیکەرێکی بەفرینی دەستی خودا دەچوو.

هەرچۆنێک بێت، حەکیمەکە پەنجەیەکی دا لە پێستی، پێستی هەڵنەوەری، بەس شل و نەرم و گەرم بوو. یەواشێک هەناسەی دەدا. بە دوو پەنجە لێوی کردەوە، ناودەمیشی سپی بوبوو، زمانی نەمابوو. سەرەتا حەکیمەکە وای زانی چاوی ڕێشکەوپێشکە دەکات، کە ورد بووەوە، هەر بەڕاستی زمان لە دەمیدا نەمابوو. خاوەنی دوکانی گوڵفرۆشەکەی بانگ کرد، "وەرە کابرا سەیر بکە، ئەم مرۆڤە هەر زمانی نییە." پێکەوە سەیری دەمیان کرد و بەحەپەسانەوە لە یەکتریان دەڕوانی. سوێندی خوارد پێش ئەوەی بێت بەشوێن تۆدا، زمانی بە چاوی خۆی بینوە، خێر بوو ئەم مرۆڤە بە چەند چرکەیەک شتەکانی گۆڕان، خوا بکات تۆزێکی تر نەبێتە گوڵێکی سپی، یان فریشتەیەکی ئاسمانی و لە ژوورەکە بدا لە شەقەی باڵ.

حەکیمەکە نائومێد بوو، دەیزانی تەواو بووە. جوانییەکەشی وای لێ کردبوو دڵی نەدەهات جێی بهێڵێت. تەنها بۆ دڵدانەوەی خاوەنی دوکانی گوڵفرۆشەکە ڕەچەتەیەکی نووسی و پێی وت، "من دەڕۆم، ئەمەی بدەرێ. گەر شتێکی نوێ ڕووی دا، بانگم بکە."

حەکیمەکە ڕۆیشت و ئەویش ماددەکانی ناو ڕەچەتەکەی دروست دەکرد، کتوپڕ ڕووناکیی ژورەکە زیاتر بوو، لەناو ڕوناکییەکەدا نالیی باڵدار بەسپێتی هەڵسایە سەر پێ. دوو باڵی گەورەی پێوە بوو. بەزەردەخەنەوە سەیری خاوەنی دوکانی گوڵفرۆشەکەی دەکرد و دەرگاکەی کردەوە و لە دەرگاکەوە چوویە دەر و لە بەردەم گوڵەکاندا دای لە شەقەی باڵ و تێکەڵ بە ڕووناکیی تیشکی هەتاوەکە بوو. کابرای خاوەندوکان لە شوێنی خۆی وشک بووبوو.

کە ڕووناکییەکە نیشتەوە، سەیری جێگەکەی کرد، لاشەیەکی وشکەوەبوو، تەرمێکی وشکەوەبوو لەسەر جێگاکە جێ مابوو. نەیدەزانی خەون دەبینێت یان ڕاستییە. ئەوە ڕۆحەکەی بوو دای لە شەقەی باڵ. بەخەمباری دەستی لە ڕەچەتەکە هەڵگرت و یەواشێک لیفە جاجمە بەدەستدروستکراوەکەی خۆی دا بەسەر تەرمەکەدا و دەرگاکەی لە شوێنی خۆی داخست و ڕۆیشت بۆ مزگەوت.

کەسی نەبینیبوو دۆستی بێت و بیناسێت. لە مزگەوتەکە داوای یارمەتیی کرد بێن ئەو تەرمە بشۆن و لەسەر گۆڕستانەکەی سەر کەنارەکە بینێژن، بۆ ئەوەی وەک هەموو مردووەکانی تر ئێواران سەیری دەریا بکات.

## (٩٩)

**تەرمێکی تەنیا.**

دوو فەقێ و دوو خێرخواز هاتن لەگەڵی.

دارەمەیتێکیان پێ بوو. تەرمەکەیان خستە ناو دارەمەیتەکە و خستیانە سەر شانیان و بەناو گوڵی ناو دوکانەکەدا هێنایانە دەرەوە.

ئەو ڕۆژە کەس نەبوو کەرەکەی ببات بۆ سەر تەپۆڵکەکان، لە پشتەوە بەسترابوویەوە و دەنگی لێوە نەدەهات.

تەرمەکەیان برد بۆ مزگەوتەکە و مردوشۆرێک هات بەجوانی شوشتیان. تەرمێکی لاوازی بێگۆشت. تووکی سپی و سەرسینەی کەمێک شین بووبوویەوە. تەرمشۆرەکە ورد بوویەوە لەسەر سینەی، تا بزانێت شوێنی لێدانە یان شوێنی کەوتن، چەندێک لێی ورد دەبوویەوە، بۆی ڕوون نەدەبوویەوە شینبوونەوەکەی سینەی هیی چییە. نەیدەزانی ئەوە شوێنی برینی نیشتمانە.

دوای شوشتن و کفنکردنی، بەرەو گۆڕستانەکە بردیان. خاوەنی گوڵفرۆشییەکە گۆڕێکی ئامادەی بۆ کڕی و خستیانە

ناو گۆڕەکەوە.

دوای ڕۆیشتنی خەڵکەکە، گەڕایەوە بۆ دوکانەکەی و چووە هۆدەکەی پشتەوە، کەرەکەی بەر دا و کەرەکە یەکسەر بەرەو گۆڕستانەکان دایە غار.

ئەو دەستنووسانەشی لێی جێ مابوون، هیچ لە زمانەکەیان تێنەدەگەیشت.

ئەو پیاوەی باڵەکانی گەورەتر بوون لە قاچەکانی، ئەو پیاوەی زمانی میرنشینێکی گۆڕی، خۆی کاتی مردنی زمانی ون بوو. ئەو پیاوەی هەتا سەفەری نەکرد و نیشتمانی جێ نەهێشت، کەس نەیزانی چی کردووە و چیی جێ هێشتووە. لە غەریبیدا لەپشت دوکانێکی گوڵفرۆشەوە، لە هۆدەیەکدا کە تەنها تاقێکی هەبوو بۆ هاتنەژوورەوەی ڕووناکی، مرد.

کابرای گوڵفرۆش ڕووی نەبوو لای کەس باسی بکات، بە چاوی خۆی بینیویەتی شاگردە گوڵفرۆشەکەی باڵی پەیدا کردووە و زمان لە دەمیا نەماوە و لە بەردەم دوکانەکەدا شەقەی باڵی هاتووە و پەڕێک لە باڵەکانی لێبووەتەوە و کەوتووە بەسەر گوڵە سوورەکاندا و ئێستا ئەو پەڕەی لەنێوان دەستنووسەکان داناوە، هیی خاوەنی ئەو دەستنووسانەیە. دەترسا ئەم چیرۆکە باس بکات و خەڵک بیدەنە بەر گاڵتە و بە درۆزن و خەڵەفاو باسی بکەن. بەس بەو چاوانەی خۆی هەموو ئەو شتانەی بینبوو. پەڕە جێماوەکەش پەڕێکی سپیی گەورە بوو. لەسەر گوڵە سوورەکان پاڵ کەوتبوو.

دەستنووسەکانی پیشانی دوو-سێ کڕیاری گوڵ دا. یەکێکیان کەمێک لە پیتەکانی دەناسین و فارسیزمانێک بوو، دەیتوانی بیخوێنێتەوە، بەس نەیدەزانی مانای چییە. خاوەنی

دوکانی گوڵفرۆشەکە لێی پرسی بۆ ناوەکەی بگەڕێ. ئەویش گەڕا، ناوەکەی دۆزییەوە و وتی ئەم شاعیرە ناوی، "نالیی باڵدارە."

## (١٠٠)

**گوڵە سوورەکان شەونمیان لەسەر نیشتبوو.**

دوو سندوق گوڵی سووری نایە سەر یەک و بەرەو گۆڕستانەکە ڕۆیشت.

لەسەر گۆڕەکەی دەستی کرد بە گوڵناشتن. گوڵەکان لەو جۆرە گوڵانە بوون، کە کەس بۆ سەر گۆڕستان بەکاری نەدەهێنان، گوڵی گرانبەهای بەردەم پەنجەرەی ماڵی خانەدانەکان بوون. لە هەرچوار دەوری گۆڕەکەی و سەر سنگی پڕ کرد لە گوڵ.

گوڵەکان وردەوردە گەشانەوە و ڕیشکەکانی خۆیان ئاڵاند لە دەست و پەنجەی تەرمەکەی ژێرەوە. ئەوانەی سەرسنگی خۆیان ئاڵاند لە ئازارەکانی و ئازاری سەرسنگی هێندە بەهێز بوو، دوای دوو ڕۆژ گوڵەکانی سەرسنگی وشک هەڵهاتن.

بۆ هەفتەی دابێ گوڵفرۆشەکە بە خۆی پەقرەجێک ئاوەوە هات تا ئاوی گوڵەکان بدات. کە نزیک کەوتەوە چیی بینی؟ سەرتاپای گۆڕستانەکە بووبوو بەو گوڵە سوورانە. تەنانەت هێندە بەچڕی نیشتبوونە سەر یەک، نەیتوانی گۆڕەکەی

بدۆزێتەوە. خۆیشی بۆیە ئەو گوڵانەی لەسەر ناشتبوون، تا خزم و کەس و کاری پەیدا ببن و بەو گوڵانەدا گۆڕەکەیان پیشان بدات و دەستنووس و پەڕی باڵەکەی، کە بەئەمانەت لای خۆی هەڵی گرتبوون، بیانداتەوە.

بەڵام گۆڕستانەکە بە جۆرێک تەنرابوو لە گوڵی سوور، تازە کەس گۆڕی ئازیزەکەی خۆی نەدەناسییەوە. ئیدی بێئومێد بوو، ویستی بگەڕێتەوە، بینیی کەرەکەی بەنەرمی بەرەو گۆڕێک دەچێت و لەسەر گۆڕێک ڕاوەستا. بە کەرەکەدا زانیی ئەوە گۆڕەکەی نالیی باڵدارە، چونکە هیچ کەس وەک ئەو کەرە خزمەتی ئەوی نەکرد و هاوسەفەری نەبوو.

گوڵفرۆشەکە بە بینینی ئەم پەرجووانە لەم پیاوەدا، خەریک بوو مێشکی تێک بچێت.

کە هاتەوە بۆ دوکان بۆ ئەوەی چیتر بیری لێ نەکاتەوە و وەک ئەوانی تر لەبیری بکات، دەستنووسەکانی بردن لە یەکێک لە مزگەوتەکان لەسەر تاقێک دای نان و ڕۆیشت.

دوای ئەو کێ دەستنووسەکانی بردووە؟ نازانم. پاشان کێ هەواڵی داوەتەوە بە میرنشینەکە کە نالیی باڵدار فڕیوە؟ کەس نازانێت بەرەو کوێ فڕیوە؟ ئەوەش نازانم. سالمی پەنجەشین لە هەواڵی فڕینەکەی ئەودا چیی کرد و چیی نەکرد؟ ئەوەش نازانم.

بەس ئەزانم ئەو پیاوەی هەمیشە لە فڕیندا بوو، لە نیشتمانەکەی خۆیدا شوێنی نەبووەوە و لە غەریبیدا مرد.

هەرچەندە خۆی دەیگوت،

(شەرت بێ نەچم، تا ئەم خوارە بێ تۆ...)

بەس ئەم جارە بەتەنیا چوو.

